فۆلكلۆری

# یاری یەكانی كوردەواری

محمد كریم شریف

بریتیە لە (١٢٠) یاری فولكلوری

محمد كريم شريف

# فۆلكلۆری

## یاری یەكانی كوردەواری

بریتیە لە ( ۱۲۰ ) یاري فولكلوری



لە چاپخانەی ( الشمال ) لە كەركوك چاپ كراوە
چاپی یەكەم ـــ كەركوك ۱۹۷۱

# پیشەکی

بە پێنووسی ماموستا مەجید ئاسنگەر

هەموو نەتەوەیێکی ئەم جیهانە گەورەبێ یـا بچووك ، پێشکەوتووبێ وەیا جیماوو دواکەوتووبێ ، کەم یا زۆر سامانێکی میللی تایبەتی بەخۆی هەیە کە بە درێژایی مێژوو بۆی پێکهاتووەو لە باوو باپیرانەوە پشتاوپشت بۆی هاتووتەخوار ئەمیش بە پێی رۆژگارو بە گوێرەی پلەی ژیانیو پێویستیی رۆژانەیـــەوە تەتلەی کردووەو دەستی گۆڕانی تێهاویشتووە فۆلکلۆریش بەشێکی هەرە گرنگو دیـاری ئەو سامانەیە فۆلکلۆری هەر نەتەوەیەك لە جەرگەی بەسەرهاتـو سەرگوزەشتی ژیانی دێربنی ئەو نەتەوەیە هەلقولاوەو ئاوێنەیێکی پاکو بێگەردە کە نیگارو روخساری راستەوخۆی گوزەرانو جۆری ژینو ئاستی رۆشەنبیری ئەو میللەتە نیشانئەداو ئامرازێکی شیاوە بـۆ ناسینی مێژووی رابووردوو چ لە بـاری کۆمەلایەتیو ئـابووریو رامیـاری چ لە بـاری پلەی زانستو زانیـاریو جـۆری بـیرو ڕای لـە بـاوا

جـا لەبەرئەوەی کـە ژیانو بەسەرهاتی نەتەوەکان لە زۆر لاوە لیك جیا بووەو هەریەکەیان بە ڕێبازێکی تایبەتیدا رۆیشتووەو جۆرە تاقیکردنەوەیەکی بەسەرا تێپەڕیوە کـە بـە

ئەندازەو شیوەیێکی خۆمالی تۆماری کردووە - هەر چەندە لە بڕینی قۆناخەکانی مێژوودا یەکیان کرتووەتەوە - بۆیە ئەبینین هــەر نەتەوەیەك فۆلکلۆریکی سەربەخۆی تایبەتیخۆی هەیە وەك گەنجینەیەك بۆی ماوەتەوەو شانازی پیوە ئەکات . گەلی کوردیش کە بە دریژیی میژوو لەم کوردستانەیدا ژیاوەو زۆرەها قۆناخی بریوەو هەزارەها رووداوو تاقیکردنەوەی بەسەرا هاتووە ، وەك هەر نەتەوەیەکی زیندووی ســەر ئەم زەمینە ، خاوەنی سامانیکی فولکلوری ئیجگار بەهادارو لە نرخ نەهاتووە کە وەك ئەستیرەیەکی پرشنگداری شەوی تار ئەدرەوشیتەوەو لەنیو پاشماوەی گەلانا مایەی شانازییو جیگای سەربەرزی یە .

فۆلکلوریش چەند بەشیکی هەیە : وە تائیستە لــە کوردیدا کەم یا زۆر لە بابەت هەموو بەشەکانیەوە چەند نامیلکەو پەڕاوو لیکولینەوەیەك دراوەتە چاپەوەو لە نامەخانەی کوردییا کەلینیکیان گرتووەو وەك گەنجینەیەکی نەتەوەیی ئەو سامانەیان بە میژوو سپاردووە بو پاریزگارییو دەربازکردنیانەوە لە چنگ وونبوونو لەناوچوونا . بەلام ئەوەی جـــێی سەرسوڕمانە لەم کوڕەوە ئەوەیە کە وەك پیویستە هەتا ئەمڕو کەس لە خویندەوارو نووسەرو زاناکانمان بایەخی بەم بەشەوە نەداوە لە فولکلوری کوردیدا کە پەیوندی بە یارییەکانی کوردەوارییدا

هەیەو بـە شێوەیەکی ریکو پێکو دروست لێیان نەکۆلیوەتەوەو لەسەریان نەنووسیوە . ئەمەش بە لای منەوە کاریکی گرنگەو کە تا ئێستێ خراوەتە پشتگوێ ئەبێ لەمەولا کەمتەرخەمی لـــێ نەکرێو مافیخۆی پـــێ بدرێتەوەو شارەزایان قۆلی چالاکی لێ هەلمالن وە بە دوایـا بکەوێن ، ئەوەی چنگیـان ئەکەوێ کۆیبکەنەوەو لە دوای پوخت کردنیا تۆماریبکەنو ئەمیش لە مەترسی لەیادکردنا بپارێزن .

فۆلکلۆری یارییەکان کوردی ئەو بەشەمان بـــۆ روون ئەکاتەوە لە ژیانی کوردەواری دیرینا کە لە کاتـی حەسانەوەو بێکاریدا خویانیان پێوە خەریك کردووە : بەشـی رابواردن : جـا لیرەدا ، پیویستە دان بەمەدا بنێین کە بە هوی گوڕانی جورو باری ژیانو پیشکەوتنی مرۆڤایەتی لە هەموو روویکەوەو پەیدابوونی زۆرەها هـوی ڕابواردنو یاری تازە بابەتەوە لـــە لایێك ، وە تەسك بوونەوەي کاتی رابواردن سەبارەت بە ویلیو گەڕان بە شوین ئیشو کارەوە لەبەر سەخت بوونی گوزەرانـی زۆربەی چینەکانی گەلەوە لە لایەکیترەوە ، بەتایبەتی ئەو گەلە هەژارو دواکەوتووانەی زەبری رۆژگار لەژیر باری چەوسانەوەو زۆرداریـیا پشتی کوم کردوونەتەوە کە نەوەی کوردی لێقەوماومان یەکیکە لەمان ، ئەلیم بە هوی ئەو هەموو گوڕانو داهاتە نوێیـانەوە خەریکە ووردە ووردە زۆربەی زوری

یاری‌یەکانی خومان‌مان لەبیر ئەچینەوەو تویان نامینێ لە ناومانا ، بگرە تاکو تەژایان نەبی کە لیرەو لەوێ بەشیوەیکی زۆر کزو بی پرەوا شوینەواریان ماوە ئەگینا ژمارەیەکی زوریان هەر ناویشیان لەناوانەماوەو لە گومی بیرچوونەوەدا نوقم‌و بزربوون . سا لیرەدا من نالیم ئەبی هەموو ئەو یاری‌یانە وەک لە ئەژادا هەبوون ئاوا ئیستا زیندوویان بکەینەوەو بیانخەینەوە گەڕ ، چونکە لە باری ژیانی ئەم سەردەمەی چوونە ناو مانگ‌و پشکنینی ئەستیرەکانا ، نە ئەو ماوەیەمان هەیە بەو هەموو یاری‌یانەوەی رابویرین‌و نە یاری‌یەکانیش گشتیان بو رابواردنی ئەمرومانا ئەشین . بەلام مەبەستم ئەوەیە کە وەك کەلەپووریکی فولکلوری‌و سامانیکی کونی نەتەوایەتی هەر هیچ نەبی ئەو یاری‌یانە تومار بکەین‌و لە فوتان‌و سڕانەوەیان بپاریزین ، بو ئەوەی چینەکانی ئیستەو دواروژمان لە بەشیکی میژووی رابوردوویانەوە ئاگاداربن‌و بزانن باوو باپیرانیان چون کاتی بی کاری‌و پشوودانیان بەسەر بردووە ، ئەمەش کەمترین پیویستە کە لە ئەستوی رولەکانی کوردە بیکەن .

جا ، بویە ، ئەم ئەرکەی کاك محمد کریم شریف خستوتیە سەر شانی خوی‌و ئەو تەقەللایەی لەم رووەوە داویەتی ، کە بەشی زوری هەموو ئەو یاری‌یانەی کو کردوتەوەو

بە دریژی باسی چونیەتی پیهەلسانو ژمارەی بەشدارانی هەر یاری‌یەکی کردووەو یاری‌یەکانی کوڕانو کچانو تیکەلاوی دەس‌نیشان داوە . ئەم ئەرکەو ئەو هەولەی کاریکی گرنگەو سوود بەخشەو شایانی ئەوەیە بە چاویکی قوولو هەستیکی پیروزەوە سەرنجی لیبدریتو ریزی لی‌بنریت . چونکە بەم بەرهەمەیا کەلینیکی فراوان لە نامەخانەی کوردیا پڕئەکاتەوەو لاپەڕەیەکی زیرین لە میژووی گەلەکەمانا ئەڕازینیتەوەو دەرگایەک لە فولکلوری کوردیدا ئەکاتەوە کەسی لەمەوبەر دەستی بو دریژ نەکردووە . هەر لەبەر ئەمەشا کە ئەم بەرهەمە یەکەمین هەنگاویکە نراوە لە باسیکا کە زور فراوانو تیکەلاوەو بە کوششی تەنیا کەسیکا کە لە نوژەن خوی فڕیداوەتە کوڕی ویژەو میژەووا مافی خوی پی نادری ، لەبەر ئەمە ، لە ووزەمانانیە بلیین بەرهەمەکەی پڕ بە پیتی باسەکەیەو دوورە لە کەمو کووری ، بەلام ئەوەندە ئەلیم کە ئەم پەرتووکە تاکە هەنگاویکە لە ریکەداو هەنگاویکی ئازاو زلیشە ، جا : پڕ بە دل سوپاسی دانەر ئەکەمو هیوام زورە خوینەرانی بەریز بە چاوی دلسوزی‌یەوە ئەیخویننەوەو هەر کەمو کووریەکی هەبی لە دواروژا ئەی‌برنو ئەم بەشە گرنگە

له فولکلوری گەلەکەمانەوە ئەبەنـە ریـزی بەشەکانـــی تریەوە . هیوا ـ ش سەر چاوەی ژینە ! .

مەجید ئـاسنگەر

هەولـــێر : ١٠ / ١٠ / ١٩٧٠

# سەرەتا



یاری بەشێکی گرنگە لە بەشەکانی فۆلکلۆری کوردی ، وە بەرهەمێکی زۆر بە کەلکە بۆ پێگەیشتنی منداڵ . ئەم هەموو یارییانە بچوک کراوەو ئاوێنەی ژیانو کارو بارو خووو رەوشتی کۆمەلایەتیمانن. منداڵ بەهۆی ئەم یارییانەوە پەروەردە ئەبێت لەسەر خووو رەوشتی کۆمەلەکەی بو پێگەیشتنو چوونە ناو کۆمەڵ . هەر یارییەك کەلکی خوی ئەگەیینێ .

ئەم پەڕاوە زۆربەی یارییەکانی کوردەواری تیدا کوبوەتەوە ، کە خەریکن وونئەبن ، وە لەناو کومەڵدا کەم بەکاردێن . لەبەر شارستانیەتی ئەم سەردەمەو گوزانی ژیانی

کۆمەلایەتی . وەخەریك بوونـــی ئادەمیزاد بە پەیداکردنی پیویستەکانی ژیان ، وە پەیدابوونی گەلێ هوی تازە بۆ بەسەر بردنـــی کات وەك : « یـانـە ، گـازینۆ ، نامەخـانە ، سینمـا . . . هتد » .

هەروەها منداڵیش لە شارستانیەتی ئیستـا بە گەلێ جـور بەستراوەتەوە لە بەجـــێ هینانـــی ئارەزووی خـــوی لە یاریکردنا ؟ .

لە لایەکیان زوری ئۆتومبیـلو گەلێ هـۆی ترسینەریتر کە مەترسی ئەخاتە پیش یاریکردنی منداڵان ، لە لایەکیتریشەوە سینەماو تەلەفزیونو هۆیەکانی تری رابواردن دیسان زۆر کاری کردووتە سە یا . لەبەرئەوە ئەمەوێ ناوی ئەم یارییانە هـەر بهینێ کە بەرهەمیکی باوباپیرانمانە بـە سەددەها سـاڵ لەمەوپیش بۆمان ماوەتەوە .

ئـەم یارییانەی کە نووسیمەتەوە زۆربەی خـوم تیـــدا بەشدار بویمـە ، بەلام ئەوانەیتر کـە چۆنیەتیەکەیم نەزانیوە یەکـە یەکە لـە گەورەو بچووك پرسیارمکردووە . چەنـــد هەلبەستو گۆرانی لەگەل ئەم یارییانەدا ئەووترێن گشتیانـم نوسیوەتەوە کە ئەبیتە هۆی رازاندنەوەی یارییەکان .

هەندێ لەم یاری‌یانەش شایانی ئەوەن کە لەسەر شانۆیەکانا پیشکەش بکرێن وەك : [ ئەستێرە پەنگەستێرە ، تیتلی‌سماق ، حوحایێ ، حەمەشکێ ، حیللانێ « حیولانێ » ، دونگەمەڕانی ، سابونەڕەقە ، سوتام برژام ، گڵۆلە موو ، گوریس کیشکانێ ، گوێ‌فڕکانێ ... هتد ] . ئەمانە لە یاری‌یەکانی مندالانە ، بەلام لە یاری‌یەکانی گەورانە کە شایانی سەر شانۆن ئەمانەن : [ ئەزە لەزە « ئەشکە لەشکە » ، کەرو ئاشەوان ، دارکیشکانێ ، تەندوورە سورکێ ، خەجەڕۆ « خواجەڕۆ » ، دیزەو گوزە ، بارە خیبانی ، سەرلی‌شیواندن، زمان تەتلە پی‌کردن ، نسان نانانێ ... ] . زوربەی ئەم یاری‌یانەی گەورانە لە شەوانی ئاهەنگی بووك گواستنەوەو رابواردنی شەوانی زستان لە حوجرەی فەقییانو دیوەخانەکاندا ئەکرا . زۆر خۆشتر بوون لە سینەماو تەلەفزیونی ئیستا : چونکە هەرکەسیك دەسەڵاتی هەبوو لە یاری‌یەکانا بەشداربیت .

ئەو یاری‌یانەی تایبەتی‌نین بە کوردەواری وەکوو : ناولە ، شەترەنج ، بلیارد ، توپ توپێن ، دامە ، غارغارێن ، کەللایانی « هەلماتێن » ، مزراحێن ، جوللانە ، زۆرانێ ، کەوشەك ... هتد ) . ئەم نووسینەوە لەبەر ئەوەی نەك لە کوردستانا بەلکو لە زۆربەی وولاتەکانی جیهانا بەکاردێن .

لام‌وایە لە کوردەواری هیچ کەسیك نیە چەند یاری‌یێك لەم یاری‌یانەی نەکردبی ، چ بە گەورەیی یا بە بچووکی . بەتایبەتی بیست سی سالێك لەمەوپیش کە منداڵەکان پیشەیان تەنیا یاری‌کردن بو . هەتا لە تاریکەشەوا کە چاو چاوی نەئەبینی هەر لە یاری‌یەکانی خۆیان بەردەوام بوون ، چەند منداڵێك هەر یەکە بنە کەلاشێکی لاستیقی بە دەستیەوە ئەگرت کە سەریکی بە ئاگر ئەکرا ، بە ناو کۆلانو گەزەکەکانا ئەسوڕانەوە یا ئەچوونە گۆزە پانەکانی جیگای جۆخینان . ئاگرەکان لە دوورەوە وەکوو ئەستیرە جریوە جریویان بو ، هەر منداڵێك لە ماڵەوە کە ئەی‌دی بە پەلە رای ئەکرد بۆ ناویان . کە زۆر ئەبوون دەستیان ئەکرد بە بەستەو گۆرانی .

لە شەوانی زستانیشا باوی « شەو چەرە » بوو کە چەند منداڵێك لە دیار سۆبە یا ئاگردان دا دائەنیشتن‌و بە ریزە هەر جارەی یەکیکیان چیرۆکیکی ئەگیڕایەوە ، یان گەورەکان چیرۆکیان بۆ ئەکردن‌و منداڵەکانیش گۆیان بۆ شل ئەکرد .

ئیستاش وەك شەوو رۆژ لە یادمە ، لە کاتی منداڵیما لە گوندی « کاینج » * چەند منداڵێك هەموو شەو کە لە پیش منداڵەکانی‌ترا لە ماڵەوە دەر ئەچوون یەکە یەکە بە دووای

---

* کاینج : ٢٥ کیلو مەتر لە هەولیر دوورە کەوتووتە سەرووی روژ ئاوا نزیك زیی بادینان .

هاوڕێکانیاندا ئەگەڕان ، لە بەر دەرگای ماڵی هەر یەکێکیان چەند جارێك بە دەنگێکی بەرز هاواریان ئەکرد :-

هەرێ هەرێ ؟.
« فیسارم »م * بۆ باوێنە دەرێ .
ئەگەر ناشیهاوێنە دەرێ ؟!
کلاشیکم بۆ باوێنە دەرێ !.

منداڵەکە ناچار لە ماڵەوە رائەپەڕیو تێکەڵیان ئەبوو ، ئەمجا ئەچوونە بەر ماڵی یەکێکیتر لە هاوڕێکانیان بەم جۆرە هەتا هەموویان کۆ ئەکردنەوە ، لە پاشا دەسیان بە یاری ئەکرد .

تا ئیستا هیچ پەڕاوێك نیە لە سەر یارییەکانی کوردەواری تەنیا ناوەکانیان نەبێت کە لە چەند پەڕاوو گوفارێك چەندیکیان دیار کردووە ، فەرهەنگی خاڵ چەند یارییکی بە کورتی تیا باس کراوە ، مامۆستا علاءالدین سجادی لە « هەمیشە بەهار » دا راوە ژیشکی بە شیوەی چیرۆك نووسیوەتەوە مامۆستا مەلا محمدی کۆیی « فڕێ فڕێ قەل فڕێ »ی بو باسیکیتر نەختێ راڤە کردووە ، کاك رؤوف احمد حسن لە « تویشە بەرە » دا باسی تەڕکی بن بەڕەی کردووە ، « سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردی » وگوڤاری تیشكو رووژی نوێ

* ناوی هاوری‌کەیان ئەووت کە لەم ماڵە دایە .

ناوی زۆر لە یاری‌یەکانی تیدایە بەلام راڤە نەکراون .

ئەم یاری‌یانەی کە لەم پەڕاوەدان نالیم هەموو بەلام زۆربەیان کەوتوونەتە پشت گوێ‌و پەیوەندیان بە چینی تازەوە نەماوە ، ئەم بەرهەمە زلە خەریکە لە ناو بچیت !

ئەم هەموو هویانە هانیان دام بو نووسـینەوەی ئەم یاری‌یانەو دەرخستنەوەیان بو یادگاری‌و ژیاندنەوەیان کە ئەبتە هۆی شانازی ئیمە بە پاشماوەکانی باو باپیرانمان .

منیش بە شانازی‌یەوە ئەم نۆبەرەیەمتان پیشکەش ئەکەم هیوادارم کە لە کەم‌و کوڕیەکەم ببورن .

محمد کریم شریف

هەولیر : ١٩٧٠/٤/١٠

# بەشی یەکەم

# یاری یەکانی مندالانە

## سێ جۆرە

١ــ تایبەتین بە کوڕان .

٢ــ تایبەتین بە کچان .

٣ــ کوڕو کچ بە هاوبەشی ئەیان کەن .

# ١ ـ یاری یەکانی کورانە

## ١ ـ ئەستیرە پەنگەستیرە

لە بەینی « ٤ ـ ١٠ » منداڵ ئەکریت ، لە تەمەنی « ٨ ـ ١٢ » ساڵیدا ، هەموو بازنەیی بەرانبەر یەك دائەنیشن وە پێیەکانیان بۆ پیشەوە دریژ ئەکەن یەکیکیان لە بەینی هەموویانا بە پیوە ئەوەستێ ، لە جیگای خۆیەوە ئەخولیتەوەو ئەڵیت :

ئەستیرە پەنگەستیرە
ئاگرەکی باوێ ئیرە

لە پڕ خۆی ئەخاتە خوارەوە بۆ سەر منداڵەکان ، ئەوانیش بە پیلەقە لیی ئەدەن‌و هەر یەکەیان لە خوی دوور ئەخاتەوە ، لە دووابیدا کەوتە سەر کامیانو پیی دەر نەکریت لە سەر پییەکانی ئەویان تێ ئەکەویت‌و لە جیگای منداڵەکەی پیشودا لە ناوەراستا ئەوەستی‌و ئەسوڕیت وەکوو منداڵەکەی پیشو هەتا یەکیکیتر تێ ئەکەویت‌و خۆی رزگار ئەکات‌و منداڵە تیکەوتووەکە جیگای ئەگریتەوە ... ئیتر هەر ووها .

# ٢ـ ئەستی لە باخەل

« ٦ ـ ١٢ » منداڵ تیدا بەشدار ئەبن ، ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، هەر بەشەی سەرداریکیان هەیە ، سەردارەکان « تەڕو هیشکانێ » ئەکەن . کامیان سەرکەوێ ئەنگوستیلە یا هەر شتیکیتر لە باخەڵی یەکیك لە لایەنگیرەکانیا ئەشاریتەوە ، بەشەکەی تریش بە هەموویان تەنیا شکیکیان هەیە کە بڵێن لە باخەڵی « فیسار ° » ە . ئەگەر لە باخەڵیا دەر بچیت ئەوا بەشەکەیتر شتەکە ئەشارنەوە ، ئەگینا هەر بەشەکەی پیشوو دووبارە ئەیشاریتەوەو هەر جارەی ژمارەییکیان بۆ دائەنریت . هەتا جاریك بەشەکەیتر شتەکە ئەدوزنەوە ، ئەمجا سەردارەکەیان شتەکە لە باخەڵی یەکیك لە هاوبەشەکانیدا ئەشاریتەوە ، بەشەکەی تریش بە دووایدا ئەگەڕیزو شکیان لە کامیان بیت ئەڵین لای ئەوە ، جا بە چەند جاریێ دۆزیانەوە ئەوەندەیان لە سەر ئەژمیردریت .

لە دووایيدا کە لە یاریەکە تیر ئەبن کام بەش ژمارەی زورتر بیت ئەوەیان سەر ئەکەویت .

---

° ناوی ئەو کەسە ئەڵین کە شکیان لێی هەیە .

# ٣ـ پشیلە سوورە

لە بەینی « ٥ ـ ١٢ » منداڵ ئەکریت ، یەکیکیان تێ ئەکەویت‌و ئەبێ بە پشیلە سوورە ، ئەوانەی تریش هەموو بە پیوە بازنەیی ئەوستن‌و دەستی یەك ئەگرن . پشیلە سوورە ئەکەویتە ناوەراستیان ، هەوڵ ئەدات لە ناو لنگی یەکیکیان دەرچیت ، ئەوانیش گشتیان بەرگریی ئەکەن‌و ریگای نادەن لە ناویانا دەرچیت وە ئەلەرینەوەو ئەڵین :

پشیلە سوورە کوێژا چوو
عەرزی دزی پیایا چوو

پشیلە لە ناوەراستیانا بەم لاو بەو لادا ئەگەڕیت هەتاکوو جاریك بۆی هەڵ ئەکەویت لە ناو لنگی یەکیکیانا دەر ئەچیت‌و خۆی رزگار ئەکات‌و جیگای تیکەووەکەی تازە ئەگریتەوە کە بە ناو لنگیا تیپەڕیوە . ئەویش ئەبیت بە پشیلە سوورەو ئەچیتە ناوەراستا ...

ئەویش لە ناو لنگی کام منداڵ دەرچیت جیگاکەی ئەگریتەوە .

# ٤ـ پەلیکانی

پەلیك : داریکە بە ئەستورایی پەنجەی نیوان ، دریژاییەکەشی
لە بستیك کەمترە ، هەر دوو سەری بە راستەو چەپ
تەنك ئەکریت بۆ ئەوەی بکەویتە سەر زەوی سەریکی
بۆشایی بیت .

دار پەلیك : داریکە بە ئەستوورایی پەلیك ، دریژاییەکەشی
لا بالیك ئەبیت ، بۆ لیدانی پەلیکەکە بەکار دیت .

## ئەم یاری‌یە دوو جورە

## ـ أ ـ

« ٢ ـ ٢٠ » مندال تیدا بەشــدار ئەبن ، ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، ئەم دوو بەشە « تەزو هیشکانی » ئەکەن کامیان سەرکەوێ دەس بەیاری ئەکەن ، بەشەکەی تریش ئەچنە بەرەوان کە « ٦ ـ ١٠ » هەنگاو لە « قزگە * » کە دوور ئەبنەوە بەرانبەریا ئەوەستن .

* قزگە : قولتیکی بە دریژایی‌و ئەستوورایی دوو پەنجەیە لە زەوی ئەکولدری .

یەکێك لە بەشە سەرکەوتووەکە ئەبێت بە وەستا ، پەلیکەکە بە بەرینی دائەنێتە سەر قزگەکەو نووکی دار یەکەکە لە ناو قزگەکەوە ئەخاتە ژێر پەلیکەکەو بە هێز پەلیکەکەی پێ هەل ئەدات بۆ لای منداڵەکانی بەشەکەیتر کە لە بەرانبەریا وەســـتاون . ئەگە منداڵەکان پەلیکەکەیان لە ئاسمانەوە گرتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی ئەوا وەستاکە لە یاری کردنا ئەکەوێت ، منداڵێکیتر لە هاوبەشەکانی ئەبێت بە وەستا ، ئەگەر پەلیکەکەی ئەویشیان لە ئاسمانا گرتەوە ئەوا یەکێکیتر هەر لە هاوبەشەکانی ئەبێت بە وەستا - بەم جورە یەکە یەکە هەتا بەشە سەرکەوتووەکە هەموویان هەر یەکە یاری خۆی ئەکاتو دەرئەچێت ئنجا بەشەکەیتر ئەبن بە وەستا . ئەم بەشەشیان ئەچنە بەرەوان .

بەلام ئەگەر پەلیکەکە لە ئاسمانا نەگیرایەوە ئەوا هەتا لە جوولە نەکەوتبێ بە پێ یا بە دەس هەر لێی ئەدەنو بۆ لای قزگەکە نزیکی ئەخەنەوە تا لە جوولە ئەکەوێت ئەمجا لەم جێگایەوە کە وەستاوە یەکێك لە منداڵەکانی بەرەوان هەڵی ئەدات بۆ قزگەکە کە دار پەلیکەکە بە بەرینی لە سەر دانراوە ، ئەگەر بە دار پەلیکەکە کەوت وەیا کەمتر لە درێژایی دارەکە لە قزگەکە نزیك کەوتبێتەوە ئەوە وەستا لە یاری کردنا ئەکەوێت بەلام ئەگەر بە دارەکە نەکەوێتو لە درێژایی دارەکەش زیاتر لە قزگەکە دووربێت ئەوا وەستا پێنج جار بە دارەکە لە سەری

پەلیکەکە ئەدات‌و لە زەوی‌یا بەرزی ئەکاتەوەو هەتا بتوانی بە هێز دارەکە لە پەلیکەکە ئەدات‌و لە قزگەکەی دوور ئەخاتەوە کە هەر پێنج جار تەواو بوو ئەمجا دووری پەلیکەکە لە قزگە چەندبێ بە دار پەلیکەکە ئەی پێون جا چەند داربێت هەندەیان بۆ ئەژمێرن . وە هەمیشـــە وەستا دەس بە یاری‌یەکە ئەکاتەوە لە سەرێەوە هەتا بەشێکیان [ تەغار ° ] تەواو ئەکەن‌و سەر ئەکەون. بەلام ئەگەر وەستـا جارێك لەو پێنج جـارەی کە دارەکە بۆ پەلیکەکە ئەوەشـێنیت لە سەر زەوی‌یا « خوت » بکات واتە « دارەکە بە پەلیکەکە نەکەویت » ئەوا وەستا لە یاری کردنا ئەکەویت‌و یەکێکی‌تر لە هاوبەشەکانی لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکاتەوە ، ئەگەر خۆشی دووا کەس بیت لە هاوبەشەکانی کە دەستی بە یاری کردبوو ئەوا بەشەکەی‌تر ئەبن بە وەستاو ئەم بەشەش ئەچنە بەرەوان .

— ب —

دوو منداڵ ئەم یاری‌یە ئەکەن ، یەکێکیان ئەبێ بە وەستا وە لە سەر قزگەکە ئەوەستی‌و پەلیکەکە زیاتر لە بەژنێك

(°) تەغاز : ژمارەیەکە منداڵەکان دیاری ئەکەن کە بە زوری لە ( ۱۰۰۰ ) ە وەیا چەندی منداڵەکان لە مەیانی خویانا قسەیان لە سەر کردبی .

بۆ دووری قزگەکە هـــەڵ ئەدات‌و بە منداڵەکەی‌تر ئەڵیت :
ئەکە ؟ ئەویش هەر دوو پێ‌بەکانی ئەخاتە سەر قزگەکەو خۆی
لە سەر زەوی دریژ ئەکات ، ئەگەر دەستی گەیشتە پەلیکەکە
هەلی ئەگریتەوەو ئەلیت : ئەگە . وەخۆی ئەبیت بە وەستاو لە
ســـەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکاتەوە . بەلام ئەگەر نەگاتە
پەلیکەکە وەیا بزانیت کە نایگاتی ئەوا ئەلیت : نەکە . وەستاکە پیی
ئەڵیت: کاکت دەگە ئەمجا لە سەر قزگەکەوە دار پەلیکەکەبۆ پەلیکەکە
هەڵ ئەدا ، ئەگەر لێی نەدا لە وەستایی ئەکەویت‌و ئەوەی‌تر
دەس بە یاری ئەکات لە سەریەوە ، ئەگەر لیشی بدات ئەوا
پینج جار لە سەر زەوی‌یا بە دار پەلیکەکە لە پەلیکەکە ئەدات‌و
هەر جـارەی پەلیکەکە لە زەوی بەرز ئەکاتەوەو لە ئاسمانەوە
بە هیز بە دارەکە لە پەلیکەکە ئەدات‌و لە قزگەکەی دوور
ئەخاتەوە ، بەم پینج جـــارە پەلیکەکە چەند لە قزگەکە دوور
کەوتبیتەوە ئەم بەینە بە دار پەلیکەکە ئەپیون چەند دار بیت
هەندە ژمارەیە بۆ وستاکەیە . ئەمجا لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە
ئەکەنەوەو هـەر خۆی وەستایە . بەلام ئەگەر هەر جاریك لەم
پینج جـــارەدا « خوت » بکات ئەوا لە وەستایی ئەکەویت‌و
هیچی بۆ ناژمیردریت وە منداڵەکەی‌تر لە سـەریەوە دەس بە

یاری‌یه‌که ئه‌کاته‌وه . بەم جۆره هه‌تا یه‌کێك له منداڵه‌کان له پێشا « ته‌غـار » ته‌واو ئه‌کات‌و سه‌ر ئه‌که‌وێت . سه‌رکه‌وتوه‌که به هێزی خۆی داره‌که له ئاسمانه‌وه له‌په‌لیکه‌که ئه‌دات ، په‌لیکه‌که چه‌ند دوور بکه‌وێته‌وه منداڵه ژێر که‌وتووه‌که به کۆڵ هه‌ڵی ئه‌گرێت هه‌تا ئه‌ی‌گه‌یه‌نێته په‌لیکه‌که‌و ئه‌ی‌گێڕێته‌وه جێگاکه‌ی خۆی ئنجا له سه‌ریه‌وه ده‌س به یاری‌یه‌که ئه‌که‌نه‌وه .

# ٥ ـ پیسکە

. لە بەینی سێ منداڵ ئەکرێ ، یەکێك ئەبی بە پیسکە دووەکەی تریش کڵاوەکەی پیسکە ئەبەنو لە یەك دوور ئەبنەوە پیسکە لە ناوەڕاستی هەردووکیانا ئەوەستیو هەوڵ ئەدا کڵاوەکەی بکەویتەوە دەستی خۆی . هەریش بۆ هەر یەکێکیان ئەبات کە کڵاوەکەی لایە منداڵەکە ڕائەکاتو کڵاوەکەی ناداتەوە کە زۆریش لێی نزیك بووەوە ئەمەیان کڵاوەکە هەڵ ئەدات بۆ منداڵەکەیترو ئەڵیت : ئەوەی بیدات دایکی بدات !. ئەوەی تریش بە پەلە کڵاوەکە ئەگریتەوەو کە پیسکە لەویش نزیك ئەبیتەوە وەکوو منداڵەکەی پیشووی لێ ئەکات . بەم جۆرە هەتا جاریك پیسکە لە لای یەکێك لە منداڵەکانا کڵاوەکەی چنگ ئەکەویتەوە .

ئەم منداڵەي کە پیسکە کڵاوەکەی لێي ساندووەتەوە ئەبیت بە پیسکە ، پیسکەی پیشووش جیگەی ئەگریتەوەو گاڵتە بە پیسکەی تازە ئەکەنو ئازاری ئەدەن لەم سەر بۆ ئەو سەر تا ئەویش لای یەکێکیان کڵاوەکەی چنگ ئەکەویتەوەو تێ کەوتووەکە جیگای ئەگریتەوە .

# ٦ ـ تاژتوله

له هاویندا که دەغڵو دان ئەدرویتەوە ، منداڵ له گوزەپانی ،جۆخینان قەنکەلاشك‌و بنه سـوزناتکی گەورە گەورە ( زل ) ئەگرنەوەو هەر یەکەیان داوە بەنیکی له قونکی گریٚ ئەداو ئەیکات بە تاژتولەی خۆی .

هەر جارەی چەند منداڵیك هەموو لەگەڵ یەکا رستەکەی دەستیان بەر ئەدەن‌و تاژتولەکانیان با ئەیان بات منداڵەکانیش بە دووایانەوە رائەکەن تا ماوەیەکی زور ، جا کامیان پیشکەوت لە تاژتولەکان خاوەنەکەی شاتازی پیوە ئەکات‌و هەر یەکە تاژتولەی خۆی ئەگریتەوەو رسـتەکەی بە دەستیەوە ئەگریٚ کە نەختی هەسانەوە هەمیشـە رسـتەکانیان بەر ئەدەنەوەو بە دووایانا رائەکەنەوە .

یا کە چـەند منداڵیك ئەچن بۆ جیکاییکی بەرداوی وەکوو کەندو زورگەکان ، بەردی پان‌و خڕ بە دەسـتیانەوە ئەگرن‌و بۆ پیشەوەی خۆیان هەڵی ئەدەن بزانن کامیان بازوویان بە تین‌ترە . جا تاژتولەی کامیان زۆر بڕوات ئەو سەرئەکەویت .

وەیا لە سەر زورگ‌و گردەکانا بەردی خڕی وەکوو تۆپ گلۆڵ ئەکەنەوە بە دامانی زورگەکانا بۆ خوارەوە ، بەردی کامیان بگاتە دامانی خوارێی گردەکە یا زورگەکە ئەو سـەر ئەکەویت .

# ٧ ـ تەقلە لیدان

مندالّ کە بۆ ناو دارستانەکان ئەچن ، خۆیان بە لقی دارە گەورەکانا هـــەلّ ئەواسن بە هۆی ئەم پەلانەوە کە لە زەوی نزیکن ، هەر دوو دەستەکانیان بستیك لە یەك دوور ئەخەنەوەو خۆیانی پیا هەلّ ئەواسن‌و پێ‌یەکانیان لە زەوی‌یا بەرز ئەکەنەوەو لە بۆشایی‌یەکەی بەینی هەردوو دەستیانا ئاوای ئەکەن‌و بە سەر سەریانەوە ئەسوڕێنەوەو تەقلەیێك لێ ئەدەن ، ئەنجا دەستەکانیان لە دارەکە بەر ئەدەن‌و خۆیان هەلّ ئەدەنەوە سەر زەوی ، هەمیشە بەم جۆرە خۆیانی پیا هەلّئەواسنەوەو تەقلەییکی تر لێ ئەدەنەوە ، جا کام مندالّ لە هەموویان زورتر تەقلە لیدا ئەو سەر ئەکەوێت .

لە ناو ئاواییش خویان بەم شەقلانەوە هەلّ ئەواسن کە لە خانی‌یە جزیزی‌یەکانا دریژ بوینەوە بۆ ژێرسواندەکان ، وەیا سەری دوولق بێت ئەوا لەژێر سواندەکانەوە خۆیان بە شەقلەکەوە هەل ئەواسن‌و تەتلەی بەسەرا ئەخۆنەوە ، یا هەردووکێ‌ی دارە دوو لقەکە ئەگرن ئنجا تەقلە لێ ئەدەن .

# ٨ ـ تیرو کەوان

تیر : کەڵە ( لیلك ° ) یکە دریژاییەکەی دوو بست ئەبێ‌و لە پەنجەی بچووك باریکترە ، پارچە تەنەکەیێك بە سەریدا ئەپاچیندریتەوە بۆ ئەوەی زۆر بڕواتو لە کاتی هاویشتنیا گرانایپەکەی بکەوێتە پێشەوە .

کەوان : داریکی نەرمی تەڕە کە لە کەڵ چەماندنەوەدا نەشکیت لا باڵیك دریژەو بە قەدەر پەنجەی بچووك ئەستوورە. دارەکە لەچەمیننەوەو ئەیکەن بە کەوانەیی‌و داوە بەنیك بە توندی لە هەردوو سەریا ئەبەستن .

ئەو مندالانەی کە تیرو کەوانیان هەبێ یاری ئەکەن لە سەر ئەوەی بزانن تیرەکەی کامیان زۆرتر ئەڕوا ، ئەگەر باش بێت زورتر لە « ١٠٠ »م ئەڕوات ، یا نیشانەی بۆ ئەگرن تاکوو بزانن کامیان زوورتر لە نیشانەکە ئەدەن.

(°) لیلك : ( قەرەمە ) کە وەکوو قەمیشە بەلام لووس‌و بێ‌گرێیە وەناوەکەشی بوش نیە .

# ٩ ـ جگانی

جك : گ ِ ێ یەکە هیسك (ئیسقان) یکە لە قاچەکانی پاشەوەی ئاژەلا لە چۆکیا هەیە . جك دوو رووی هەیە لایێکی ناوەڕاستەکەی قوڵتاییکی تیدایە پێی ئەڵێن[میر ] ،لایەکەی تری لووس و راستەپێی ئەڵێن«کەر».

کە دوو منداڵ دائەنیشن لە گەڵ یەکا جگانی ئەکەن هەر جارەی یەکیکیان جگیك بە دەست هەڵ ئەدەنە پێش خۆیان ، جگی کامیان میر بێت جگیك لە منداڵەکەی تر وەرئەگریت تا یەکیکیان هەموو جگەکانی منداڵەکەی تر بۆ خۆی ئەباتەوە ، یا لە یاری بیزار ئەبن لەمجا واز دینن .

جۆریکی تر جگانی هەیە وەکوو کەللابانی ئەکرێت ، هەر منداڵیك جگیك ، یا چەند جگیك ئەکات بە تاکە جا چەند منداڵی هەبن ، هەر یەکەیان جگیکی گەورە بە دەستیانەوە ئەگرن کە پێی ئەووترێ «حۆڵە» لە قزگەکەوە ئەیان هاوێن بۆتاکەکان .

جۆریکی تریش جگانی هەیە کە بە جغز ئەکرێ ، جغزیك لە سەر زەوییا ئەکەن و هەر یەکە جگیکی ئەخەنە ناویا بەریزە لە دەرەوەی جغزکە هەر جارەی یەکیکیان بە حۆلەکانی دەستیان لەجگەکانی ناو جغزەکە ئەدەن و لە ناو جغزەکە دەری ئەکەن جا هەر یەکە چەند جگیکی لەگەڵ لیدانا لە ناو جغزەکە دەرکرد بۆ خۆیەتی ، هەر یەکیکیش کە هاویشتی و لە هیچ جگیکی نەدا لە یاری کردنا ئەکەویت و یەکیکی تر دەس بە یاری ئەکات هەتاکوو جگەکانی ناو جغزەکە هەموو دەرئەکرین ـ ئەمجا لە سەریەوە دەس بە یاری یەکە ئەکەنەوە و هەر یەکە جگیکی تر ئەخەنەوە ناو جغزەکە .

# ١٠ ـ چاڵەوانانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی« ٢ ـ ١٠ » منداڵ ئەکرێ ، هەموو لە گەڵ یەکا لە ســەر رۆخی چاڵیك ئەسوڕێن کە قولایی‌یەکەی بەڕنە منداڵیك یا نەختێ قوڵترە . هەر لە سەر رۆخی چاڵەکە ئەسووڕێن هەتا گێژ ئەبن‌و یەکێك لە منداڵەکان ئەکەویتە ناو چاڵەکەو ئەبێ بە چاڵەوان .

منداڵەکانی تریش هەر بە دەورەیا ئەسوڕێن لە ســەر رۆخی چاڵەکەو پی‌ی ئەڵێن :

چاڵەوان چاڵت خورێ
چاڵەوان چـاڵم دەوێ

منداڵەکەی ناو چاڵەکەش جار جار لە پڕ هێرش بۆ منداڵەکانی رۆخ چاڵەکە ئەبات بە هەردوو دەستەکانی کە بیان گریت ـ ئەوانیش بە پەلە ڕائەکەن‌و لە رۆخی چاڵەکە دوور ئەبنەوە ، هەمیشە ئەگەرینەوەو گاڵتەی پی‌ئەکەن هەتاکوو جاریك یەکیکیان ئەگریت‌و لە ناو چاڵەکە دێتە دەرەوەو رزگار ئەبیت وە منداڵە گیراوەکە لە جیگای ئەوا ئەچیتە ناو چاڵەکەو ئەبێ بە چاڵەوان . چاڵەوانی پێشوو لە گەڵ منداڵەکانی‌ترا لە دەورەی چاڵەکە ئەسوڕێن‌و گاڵتە بە چاڵەوانی تازە ئەکەن ، هەتا ئەویش یەکێکیان ئەگرێ‌و رزگار ئەبێ‌و منداڵە گیراوەکە جیگای ئەگریتەوە

# ١١ ـ چاو بەستنەوە

لە بەینی «٣ ـ ١٢» منداڵ ئەکرێ چاوی یەکێکیان بە پارچە پەرۆکێك «قماش» ئەبەستنەوە ، ئەوانەی تریش هەر یەکە لە پێ کە بۆی هەڵکەوت شەپێك لە سەری چاو بەستراوەکە ئەداو لێی دوور ئەبێتەوە ـ منداڵە چاو بەستراوەکەش هەر جارەی هێرش بۆ لایێك ئەباو دەستەکانی درێژ ئەکا بۆ پێشەوەو تەنیشتەکانی ، ئەگەر یەکێکی گرت ئەوا خۆی رزگار ئەکاو منداڵە گیراوەکە لە جێگای ئەوا چاوی ئەبەسرێتەوەو گاڵتەی پێ ئەکەنو شەپی لێ ئەدەن .

هەر منداڵێك کە جاری یەکەم خۆی تەرخان بکات بۆ چاو بەســـتانەوە ، پاش ئەوەی کە رزگار ئەبیت ئەگەر بشگیرێت جارێکی‌تر چاوی نابەسترێتەوە لە بەر ئەوەی جاری یەکەم خۆی بەخت کردووە ئەیبورن .

❁❁❁❁

# ١٢ ـ چاوشارکێ (فەشیرکانێ)

« ٢ ـ ١٤ » منداڵ لەم یارییەدا بەشداری ئەکەن کە ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، دوو منداڵ هەر یەکەی لە بەشێکیان « تەڕو هیشکانێ » یا « هۆپ هۆپ قەرەتۆپە » ئەکەن ، کامیان سەرکەویت خۆیو هاو بەشەکانی خۆیان ئەشارنەوە بەشەکەی تریش لە سەر قزگەکە « لا دیواریکە » ئەمیننەوەو روویان ئەخەنە دیوارەکە هەتا بەشەکەیتر بە تەواوی دوور ئەبنەوەو خۆیان ئەشارنەوەو ئەڵێن : « وەرن »

بەشەکەی کە خۆیان شاردەتەوە بە سەر گەڕەکەکە یا گوندەکەدا ئەسوڕێن ، بەشەکەی تریش بە دووایاندا ئەگەڕێن . ئەگەر ئەوانیان دۆزیەوە ئەوا بە پیچەوانە بەشەکەیتر لە سەر قزگەکە ئەمیننەوەو ئەوانیش لە سەریەوە خۆیان ئەشارنەوە . بەڵام ئەگەر نەیان دوزنەوە ، ئەوا لە پڕ بەشەکەی خۆیان شاردووەتەوە هیرش ئەبەنە سەر قزگەکەو دەستیان لە دیوارەکە ئەدەن ، یەکیك لە بەشەکەیتر کە بە دووایاندا ئەگەڕین لە سەر قزگەکە ماوەتەوە هیرشیان بۆ ئەبات کە دەستی خۆی لە سەری یەکیکیان بدات پیش ئەوەی دەستی بە دیوارەکە بکەویت . چەنکو دەستی بە سەری هەر یەکیکیان بکەوێ پیش ئەوەی [ قژ ] بکاتواتە

دەستی خۆی لە دیوارەکە بدات ئەوا هێرش بەرەکان چاویان ئەگرن‌و بەشەکەی‌تر خۆیان ئەشارنەوە ، ئەگەر نەشی توانی دەست لە سەری هیچیکیان بدات ئەوا بەشەکەی‌تر دۆڕان کردووە گاسنیکیان لە بەشەکەی‌تر ئەبێ‌و لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە بە مەرجیك هەر بەشە سەرکەوتووەکە خۆیان ئەشارنەوە .

بەم جۆرە هەتا لە یاری تێر ئەبن کام بەش گاسنی زۆرتر بیت ئەو بەش سەرئەکەویت .

# ١٣ ـ چرە باپیرە

کە دوو منداڵ هەر یەکەیان خۆی لە منداڵەکەی‌تر بە تین‌تر بزانیت ئەم یاری‌یە ئەکەن . هەردووکیان لە بەرانبەر یەکا دائەنیشن‌و پێ‌یەکانیان بۆ پیش خویانا دریژ ئەکەن‌و لە پێ‌ی یەکا ئەیکەنە ژکە ، بە هەردوو دەستەکانیشیان دەستی یەك ئەگرن . هەر یەکەیان بە هیزی خۆی ئەوەی‌تر بۆ لای خۆیا ڕائەکیشی . کامیان بە هیزتربیت منداڵەکەی‌تر بۆ خۆی ڕائەکیشیت‌و هەڵی ئەگریت بەبی ئەوەی بە خـۆی لە جیگاکەی خۆیا بیزویت ، وە بە سەر منداڵەکەی‌ترا زاڵ ئەبیت .

# ١٤ ـ چوززەکە

« ٣ ـ ٥ » منداڵ لەم یاری‌یەدا بەشدار ئەبن ، هەر یەکەیان داریکی بە دریژ ایی لا بالیکیان لابە ، هەموو دارەکانیان لە سەر زەوی مەشکەیی لە تەنیشت یەکا ریز ئەکەن ، بەینی هەر داریك لە گەل ئەوەی تەنیشتیا پییەك‌و لا پییەك ئەبیت .

یەکیك لە منداڵەکان دەس بە یاری ئەکات ، لە سەر یەك پی بە سـەر هەموو دارەکانا بە جاریك باز ئەدات بە مەرجیك پێیەکەی تری نەخاتە سەر زەوی ، پێیەکەی سەر زەویش بە دارەکان نەکەوێ ، وە هەر لە سەر پێیەکەی پیشووی بە چوززەکە بڕوات‌و لە بەینی هەموو دارەکانا بسـوڕیت بە دریژ ایی دارەکان ، بەم چەشـنە یەکە یەکە لە سەر هەموو دارەکانیشا بازبداو تەنیشت‌و تەنیشت بڕوات ، ئنجا بۆ سەر هەر داریك خۆی هەڵ بدات ئەڵیت ( هەپك ) هەتا لە سەر هەموو دارەکان باز ئەدات . بۆ جاری سێیەم هەر بە چوززەکە یەکە یەکە پێی ئەخاتە سەر هەر داریك ئەڵیت [ هەدار ] . منداڵەکانی تریش بەم جۆرە یەك لە دووای یەك .

هەر یەکیکیان لە کاتی [ هەپك ] دا پێی بە داریك بکەویت ، یا لە کاتی [ هەدار ] پێی نەکەویتە سەر دارەکە

وەیا لە کاتی ـ وڕانەوەیدا لە ناو دارەکانـدا پێی بە دارێك بکەوێ ، یا ئەو پێیەی کە بەرزی کردووەتەوە هەتا لە یارییەکە ئەبێتەوە هـیچ جارێك بیخاتە سەر زەوی . ئەو منداڵە « تیلکە مەسوسی ° »ی پێ ئەکەن .

# ١٥ ـ چەرمەسەرانی

جـاری وا ئەبێت چەند منداڵێك چولەکەییکی زیندوو لە هێلانە دەر ئەهێنن ، یا بە هەر جۆرێك بکەوێتە دەستیانەوە؟ پێستی سەری ئەم چۆلەکەیە لە سێ لاوە ئەبڕن تەنیا پێشەوەکەی نەبێت ، پێستەکە وەر ئەگێڕنەوە سەر چاوی‌و هەڵی ئەدەن بۆ ئاسمان ، چۆلەکەی بەسەزمان لە ئاسمانا ئەفڕێت‌و چاوی هیچ نابینێ !. گەلێك خۆی لە دارو دیوار ئەدا تا گێژ ئەبێ‌و ئەکەوێتە خوارەوە . منداڵەکان بە ڕاکردن بۆی ئەچن هەڵی ئەگرنەوە ، پاش نەختێ کە دێتەوە هۆش خۆی دوو بارە هەڵی ئەدەنەوە

(°) تیلکە مەسوسی : یەکێك تێ ئەکەوی‌و چاوی ئەبەستنەوە ئەمجا گاڵتەی پێ ئەکەن‌و هەر یەکە لە پرر بۆی هەڵکەوێت تیلکیکی لێ ئەدات . ئەمە حالێتی هەتا یەکێك ئە گرێت‌و خۆی رزگار ئەکات ، گیراوەکە لە جێگای ئەوا چاوی ئەبەسترێتەوە .

بۆ ئاسمان . ئەم جارەش دەردەکەی جاری پێشوو ئەخواتەوەو ئەکەوێتەوە خوارەوە . چەند جارێ ئەم دەردە سەرییەی پێ ئەکەن ، تا چۆلەکەی بەسەزمان هەندەی خۆی لە دارو دیوار ئەدات و ئازار ئەبینێت ، بەم جۆرە خۆی ئەکوژێ .

لە بەر ئەوە چەرمە سەرانی بۆ وێنە بە ئازارێکی زۆر سەخت ئەووترێ ، کە ئەڵێن : « فیسار چەرمە سەرانەی بە فیسکە کرد » . واتە ئازارێکی زۆری پێی داوە کە لە گیانی خۆیا بێزاری کردووە .

❁❁❁❁

# ١٦ ـ چەق چەقوکەی بن گونان

« ٦ ـ ٢٠ » منداڵ بازنەیی شـــان بە شانی یەك دائەنیشن ، رانیان بە یەکەوە ئەنووسێنن و چوکیان بەرز ئەکەنەوەو پێیەکانیان لە سەر زەویا دائەنێن ، منداڵێکیش تێ ئەکەوێت و لە ناوراستی هەموویانا بە پێوە ئەوەستێ ، یەکێك لە دانیشتوەکان ئەبێت بە سەردار ، دوو بەرد لە ژێر رانی خۆیا بە هەردوو دەستەکانیەوە ئەگرێت و لە یەکیان ئەدا ، یەکێك لە بەردەکان

ئەدات بە یەکێك لە دانیشـــتووەکانی تەنیشـــتیا بەبێ ئەوەی تیکەوتووەکەی ناوەڕاست هەستی پێ بکات یا بیبینێت ، هەر یەکە لە دانیشتووەکانیش کە بەردەکەی لەوەی ئەم تەنیشتەی وەرگرت ئەیدات بە دانیشـــتووەکەی ئەو تەنیشتی تری‌و لە ژێر رانیانا ئەڕوات لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی‌تر هەتا ئەسوڕێتەوەو ئەگاتەوە دەست ســەردارەکەو هەر دوو بەردەکە چـەند جارێ لە یەك ئەدات‌و هەمیشــە ئەیداتەوە دەست یەکێك لە دانیشتووەکانی تەنیشتەکانی ...

منداڵە تێکەوتووەکە کە لە ناوەڕاستیانا وەستاوە چاوەڕوانی ئەوەیە کە بەردەکە لە دەست وەستا دەربچێت‌و لە لای یەکێك لە دانیشتووەکانی‌ترا بیدۆزێتەوە . چەنکو بەردەکە کە گەیشتە لای وەســتاو هەر دووی لە یەك دا ناتوانی داوای بکات تا لە دەست وەستاکە دەر نەچێتەوە ، جا لای هەر منداڵێك بیدۆزێتەوە لە کاتی سوڕانی‌دا ئەوا خۆی رزگار ئەکات وە لە جێگای ئەو منداڵە دائەنیشێت کە بەردەکەی لە لای دۆزیوەتەوەو منداڵەکەش تێ ئەکەوێت‌و ئەچێ لە ناوەراستا بە پیوە ئەوەســـتی‌و یاری‌یەکە دەس پێ ئەکەنەوە تا ئەویش بەردەکە لە لای یەکێك لە دانیشتووەکانا ئەدۆزێتەوە « جگە لە وەستایەکە » .

# ١٧ ـ حەلالیشك

حەلالیشك : داریکە بە ئەستوورایی پەنجەی نیوان و نەختێ لە پەنجە دریژترە ، سەریکی ئەقەڵیشن و دوو پەڕی گەورەی باڵی مریشك دینن قونکەکانیان ئەخەنە ناو قەڵیشەکە ، سەری‌تری دارەکەش تیژ ئەکەن .

منداڵ کە یاری پێ ئەکەن پەڕیکیان ئەگریت و ئەڵیت :

حەلالیشك          پەڕە مریشك

یا ئەڵیت :

حەلا حەلا لیشکێ          پەڕم پەڕێ مریشکێ

ئەمجار بە هێزی خۆی حەلالیشکەکە بۆ ئاسمان هەڵ ئەدات و پەڕەکان لە ئاسمانا وەکوو فڕفڕۆکە بە دەوری یەکا ئەسوڕینەوە لە ژێر دارەکەوە نووکە تیژەکەشی بۆ ئاسمان ئەڕوات ، کە بۆ خوارەوەش ئەگەڕێتەوە سەرە تیژەکەی بۆ خوارەوە دیت پەڕەکانیش لە سەرەوە بە دەوری یەکا ئەسوڕین حەلالیشکەکە کە ئەکەویتە خوارەوە سەرە تیژەکەی لە زەوی‌یا ئەچەقێ . منداڵەکە هەڵی ئەکیشیتەوەو دووبارە هەڵی ئەداتەوە بۆ ئاسمان .

# ١٨ ـ حەمبەلە تفغانی

لە بەینی « ٢ ـ ٨ » مندالٛ ئەکرێ . لە تەمـــەنی « ٨ ـ ١٢ » سالیدا .

دیواریك ئەکەن بە قزگەو ماوەیەك لێی دوور ئەبنەوە هەموو بە ریزە لە تەنیشت یەکا ئەوەستن ، هەموو بە جاری بە چوززەکە بۆ دیوارەکە ئەچن دەستی لێ ئەدەن‌و ئەگەڕێنەوە بۆ جیگاکەی خۆیان هەر بە چوززەکەو بە پەلەش ئەڕۆن ، لەگەلٛ چون‌و هاتنەوەکەشدا ئەلێن : « حەمبەلە تفففف ... » جا کامیان توانی لە سەر یەك هەناسە بکاتە دیوارەکەو بکەڕێتەوە جیگای خۆی بەبێ ئەوەی « هەناسە وەر بگرێ یا لە دەنگ بکەوێ » ئەویان زۆر ئازایە .

# ١٩ ـ خیتی ژنان خیتی میردان ؟

کە دوو مندالٛ لە سەر شتیك قرەیان ئەبیت‌و بە گژ یەکدا ئەچن . یەکیك لەو مندالانەی کە بۆ سەیر کردنیان وەستاون ، بەبێ خەتیك لە بەینی هەر دوو مندالە ناکۆکەکانا لە سەر زەویا ئەکیشی‌و ئەلێ :ـ

ئەمەیە خیتی ژنان‌و خیتی میردان ؟..

یەکیك لە دوو منداڵەکە خەتەکە بە پێی ئەسڕێتەوەو بزری ئەکات وەئەبیت بە میردی منداڵەکەیتر ، ئەوەی تریش کە نەویرابو خەتەکە بسڕیتەوە ئەبیت بە ژن . لە بەر ئەمە میردەکە بەوەیتر ئەڵیت :

ژنم پڕ بە گونـــم          میردی هەقیت هەر ئەمنم

منداڵە ترسنوکەکەش لە تاو ئەم جنیوە هیرشی بۆ ئەباو لێی ئەدا ، ئەبیت بە شەڕیان بۆ ئەوەی خۆی دەربخا کە ژنی ئەو نیە شەڕیکی باش ئەکەن ، منداڵەکانی تریش کە بۆ سەیر کردنیان وەستاون هەر تانیان لی ئەدەنو لەسەر شەڕەکە رشتیان ئەکەنو گاڵتەیان پی ئەکەن . ئەم دوو منداڵەش هەتا شلو کول ئەبن هەر لە سەرو گۆلاکی یەك ئەدەن .

زۆر جـار دوژمنـایەتی ئەم دوو منداڵە دریژە ئەداو ئەبیتە هۆی بە شەڕ هاتنی هەر دوو خیزانەکانیان یا خیزانی ئەو منداڵەی کە خەتی بویان کیشـــاوە لە گەڵ خیزانی یەکیك لە منداڵەکان .

# ٢٠ ـ داك داکانی

له بەینی [ ٣ ـ ١٢ ] منداڵ ئەگرێ ، هەر یەکە قاشوێنێك بە دەستیەوە ئەگرێ ، قزگەیێك « تولتێکی بچووکە » دیار ئەکەن ، گوێیکی دار نەختێ دوور لە قزگەکە هەڵ ئەدەن . هـەر یەکە لەمنداڵەکان قاشوێنیکی لە سەر قزگەکەوە بو گویەکە هەڵ ئەدات ، هەتا هەموو قاشویەکانیان لە گویەکە ئەدەن تەنیا یەکیکیان نەبی کە هیچ جارێ لیی نادات ، گویەکە ئەبیت بە دایکی ئەو..

له سەر منداڵەکە پێویستە دایکی خوی ( کە گویەکەیە ) بخاتە ناو قولتەکە تا دایکی خوی رزگار بکات . بەلام منداڵەکانیتر بەرگری ئەکەنو بە قاشویەکانیان لەگولەکە ئەدەنو لە تولتەکەی دوور ئەخـەنەوە ، منداڵەکەش هەر بە قاشویەکەی لە گویەکە ئەدات و بو قولتەکەی ئەبات .

بەلام ئەگەر منداڵەکە قاشویەکەی خوي بە لەشی هەر منداڵیك بخا ئەلی داك ، ئەوا گویەکە ئەبیت بە دایکی ئەو منداڵەی کە قاشویەکەی بە لەشی کەوتووە ، ئەوەی تریش بەم جورە دایکی خوی رزگار ئەکات بەبی ئەوەی بیخاتە ناو قولتەکەوە . منداڵەکەی تریش هەوڵ ئەدا کە گویەکە بخاتە ناو

قولتەکەو دایکی خۆی رزگار بکات . بەلام منداڵەکانیتر بەرگری ئەکەنو کە بۆیان هەڵکەوت لە پێ داریك لە گۆیەکە ئەدەنو لە قۆڵتەکەی دوور ئەخەنەوە منداڵەکەش هەوشیان بۆ ئەباو قاشۆیەکەی بۆیان دریژ ئەکات هەتا گۆیەکە ببیت بە دایکی ئەو کەسەی کە قاشۆیەکەی بە لەشی ئەکەویت ، بەلام منداڵەکان لە دەسی ژانەکەنو لێی دوور ئەبنەوە ... هـەر ووها تا جاریك قاشۆیەکەی لە لەشی یەکیکیان ئەدات و ئەڵیت « داك » واتە بوو بە دایکی ئەو منداڵەی کە قاشۆیەکەی بە لەشی کەوتووەو دایکی خۆی رزگار ئەکات ... بەم جۆرە هەتا یەکیك لە منداڵەکان دایکی خۆی رزگار ئەکاو ئەی خاتە ناو قولتەکە لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوە .

بەلام ئەگەر یەکیکیان بە هیچ جۆرێ دایکی خۆی پێ رزگار نەکرێ ، ئەوا هەمـــوو منداڵەکانیتر یەکە یەکە « هەنەژکی ، نەژکی » بە گۆیەکە « کە دایکی منداڵەکەیە » ئەکەن کە هەر یەکە لە منداڵەکان قاشۆیەکەی خۆی بە هەردوو دەستەکانیەوە ئەگرێو ســـەری قاشۆیەکە بە ژیر سکیا ئەگرێو سەرەکەی تریشی بۆ پیش خۆیەوە دریژ ئەکاو گۆیەکە لە سەر کومکی قاشۆیەکە دائەنێو ئەڵی :

هـــە نـەژکی نـەژکی نەژکي

دەتبەمە پشـــت ئەســـتیرەکی

دوو قله قەســپی ئەدەمێ

مشتێ . . . . . . . . . .

بەم جۆرە جنێوی بێوزەوەر بەگۆیەکە ئەدا کە دایکی منداڵە تێ‌کەوتووەکەیە ، هەتا گۆیەکە لە سەر قاشۆیەکە ئەکەوێتە خوارەوە ، ئەمجا یەکێکی‌تر بەم جۆرە یەکە یەکە ئەم کارەساتە بە گۆیەکە ئەکەن . جاری‌وا ئەبێت منداڵەکە خوی پێ ناگیرێ کە ئەم کارە بە دایکی ئەکەن وە بەگریان ئەچێتەوە بو ماڵەوە یا لە شەرما لە منداڵەکانی‌تر دوور ئەبێتەوە .

❁❁❁❁

## ٢١ ـ دزیی بیستان‌و رەزو نیسک‌و نوک

لە بەهارو هاوینا کە نیسک‌و نوک دان ئەگرێ ، رەزو بیستانەکان بەر ئەگرن ، منداڵ هـەر ئارەزووی خواردنی ئەم شتانە بە جۆرێکی وا ئەکەن کە مەترسی لە کەلا هەبێ . بە تایبەتی ئەو منداڵانەی نیسـک‌و نۆکیان نەچاندبێ ، یا رەزو بیستانیان نەبێت .

بە رۆژ بە ناو کەندو جۆمەکانا بەرەو بیستانەکان ئەچن کە بزانن خاوەنەکانیان ئاگادار نینە . بۆ خـواردنی گندۆرەو تەرۆزی‌و کالیارو شەمامە ، هەتا دڵیان لە سەربێ ئەیان خۆن .

ئەمجا بەڕكو باخەڵەكانیان پڕ ئەكەن‌و بە لایێكی‌ترا بۆ ئاوایی ئەگەڕێنەوە ، یا بۆ دزینی نیسك‌و نۆك بو ناو دەخڵەكان ئەچن باخەڵ‌و بن هەنگڵیان پڕ ئەكەن‌و ئەگەڕێنەوە بو ئاوایی بەبێ ئەوەی خاوەنەكەی هەست پێ بكا ، چەنكو خاوەن شینایی یەلەچاویكی هەر لای شینایییەكەیەتی ، وەیا بو دزینی‌بەری رەزەكان لە سەر تانوكەكانا ئاوا ئەبن‌و ئەچنە ناویەوەو بە دارەكانا هەڵ ئەگەڕێن تا تیرو پڕ لە بەرەكانیا ئەخۆن ، لە پاشا باخەڵ‌و بەركەكانیان پڕ ئەكەن لە میوەو لە دەرەوە ئەیان خۆن‌و سوقی منداڵەكانی تری پیوە ئەكەنەوە ، زۆر جاریش بە شەو بۆ ئەم دزییانە ئەچن چەنكو خاوەنەكانیان دڵنیان‌و چاوە دیریان ناكەن منداڵەكان بە هەوەستی خۆیان لە ناو ئەگەڕێن . خواردنی بەم جۆرەیان گەلیك لا خۆشترە لەوەی كە لە ماڵەوە بویان دابنێن‌و بیان دەنێ .

# ٢٢ ـ دەمانچوكە

دەمانچوكە : پارچە تەنەكەییكی قولانجیك دریژەو بە بەرینایی دوو پەنجەش بەرینە . تەنەكەكە بە بەرینی لوول ئەدەن سەری ژیرەوەی خوار ئەكەنەوە ، پارچە تیلیكی ئەستوور لە سەریەوە ئەخرێتە ناو بۆشاییەكەی ، سەری تیلەكەش لە لای

سەرەوە خوار ئەکریتەوە ، پارچە لاستقیکی دریژ تر لە بستیك هەر دوو سەری بە یەکەوە ئەبەســـتن ، ئەم لاستیقە بە ژیری تەنەکەکەو سەری تیلەکە ئەخەن کە خوار کراوەتەوە .

منداڵەکان یاری بەم دەمانچوکەیە ئەکەن تیلەکە رائەکیشن تا قونکی تیلەکە کە لە ناو تەنەکەکەوەیە تا نزیك دەمی تەنەکەکە دێ، پاڵە پەستووی لاستیقەکە لە سەر تیلەکە زۆر ئەبێ . دەرمانی ســـەری چەند کەلە شخاتەیەك ئەکەنە ناو لولەکە . منداڵەکە ناوەراستی لاستیقەکەو تەنەکەکە لە لای دەرەوە بە یەك دەست ئەگرێو بە هیز لە دیواریك، یا لە زەوی ئەدات بەبێ ئەوەی دەستی لێ بەربدات ، قونکی تیلەکە بە هیزی پاڵە پەســـتووی لاستیقەکەوە بو ناو لولەکە ئەچیتەوەو بە تین بە دەرمانی شخاتەکە ئەکەوێو تەقەیەکی بە هیزی لێ دەر ئەچێ .

جاری وا ئەبیت لە خافڵەتی منداڵیك ئەی تەقینێ ، هەموو منداڵەکان لە گەڵ دەنگەکەی زائەچەن .

## ٢٣ ـ زیچانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی « ٢ ـ ٦ » منداڵ ئەکرێ ، لە تەمەنی « ٨ ـ ١٤ » ساڵی‌دا .

هەر یەکەیان سی قوڵت لە پیش خویا لە زەوی بو

خوی هەڵ ئەکەنی ، هەر قولتیکی بە قەد « دوو گولم ° » یا بچوکترە ، هەر منداڵەی « ٥١ » بەردی وەکوو « هیلکە گیشکە » کو ئەکەنەوەو بەم جورە هەر یەکەیان دابەشی ئەکا بە سەر قولتەکانی خویا : قولتی ناوەڕاست پی‌ی ئەووترێ « زیچ » دە جووت‌و تاقی بەردی ئەخانە ناویەوە ، دوو قولتەکەی ئەملاو ئەولاشی هەر یەکە پی‌یان ئەووترێ « ماڵ ، یا چاڵ » هەر یەکەیان حەوت جووت‌و تاقی بەردی بەر ئەکەوێ .

هەموو منداڵەکان « تەڕو هیشکانی » ئەکەن لە سەر ئەوەی کامیان لە پیشا دەس بە یاری بکا ، کامیان سەرکەویت لە پیشا چالیکی خوی هەل ئەگرێو تەنیا بەردیکی تیا ئەهیلی‌و بەردەکانی تریش بە دەستیەوە ئەگرێو یەکە یەکە بە ریزە بەسەر هەموو قولتەکانا دابەشیان ئەکا ، تا بەردەکانی دەستی دواییان دێ دووا بەرد لە کام قولت کەوتەوە ئەویشیان وەکوو قولتەکەی پیشووی خوی بەتاڵ ئەکاو تاقە بەردیکی تیا ئەهیلیتەوە ، ئەم بەردانەش وەکوو جاری پیشوو یەکە یەکە دابەشیان ئەکا بەسەر هەموو قولتەکانا ، هەمیشە دووا بەرد لە کام قولت بکەویتەوە وەکوو قولتەکانی پیشوو تەنیا بەردیکی تیدا ئەهیلیتەوە ...

بەلام ئەگەر جاریك دووا بەرد لە دەستیا لە زیچەکەی خویا بکەویتەوو ئەوا لە یاری ئەوەستی چەنکو « زیچ » ئەکا ،

(°) دوو گولم : کە هەر دوو دەست لە تەنیشت یەکا ڕائەگیرین‌و ئەکرینە قولتیك بو ئەوەی شتیکی بخریتە ناویەوە .

منداڵەکەی دەستە ڕاستی دەس بە یاری ئەکا هەر وەکوو ئەوەی پێشوو بە مەرجێك لەزیچەکەی یاری کەرەکەی یەکەمدا باز بداو بەردی نەخاتە ناویەوە چەنکو خاوەنەکەی زیچی کردووە ، ئەگەر بە هەڵە بەردێکی خستە ناویەوە لە کاتی دابەش کردنی بەردەکاندا پێویستە سێ جووت‌و تاقێ لە بەردەکانی دەستیدا بخاتە ناو زیچەکە ، ئەگەر حەوت بەرد یا کەمتریشی لە دەستیدا مابێ ئەوە هەمووی ئەخاتە ناو زیچەکەو لە یاری ئەکەوێ بەبێ ئەوەی زیچەکەی بکات‌و منداڵەکەی دەستە ڕاستی دەس بە یاری ئەکاو ماڵێکی خۆی بەتاڵ ئەکات‌و بەردێکی تێدا ئەهێڵێتەوە ، هەر وەکوو ئەوانەی پێشوو . بەڵام ئەگەر ئەوەی پێشـــوو حەوت بەردی زۆرتر لە دەستیا مابێت هەر لە یاری کردنا بەردەوامە تا زیچ ئەکا واتە دووا بەرد لە دەستیدا لە زیچەکەی‌خۆیدا ئەکەوێتەوەو لە یاری ئەکەوێ‌و ئەوەی دەستە ڕاستی دەس بە یاری ئەکا بە مەرجێ لە کاتی بەرد دابەش کردنا لە سەر هەر دوو زیچ باز بدا کە خاوەنەکانیان زیچیان کردووە .

بەم جۆرە تا هەموو منداڵەکان یەکە یەکە زیچ ئەکەن‌و ماڵەکان چۆڵ ئەبن واتە هەر یەکەیان بەردێکیا تێدا ئەمێنێت . ئەنجا « ماڵان » ـە کە هەر یەکە لە منداڵەکان بەردەکانی هەر سێ قوڵتەکانی خۆی کۆ ئەکاتەوەو ئەیان ژمێرێ ، هەر یەکێکیان لە پەنجاو یەك بەردەکەی خۆی کەمتری مابێ ماڵێکی ئەفرۆشێ بە « ٢١ یا ١٥ » بەرد ئەگەر پێویستی هـەندە بەردەی هەبێ ،

بەلام ئەگەر کەمتری پێویست بێ ئەوا چەند بەردێکی کەم بێ بە « سەلەم » قەرز وەری ئەگرێ لەو منداڵانەی کە بەردیان لە « ٥١ » بەردەکەی خۆیان زۆرتر بیت . هەر یەکێکیشیان « ١٥ ـ ٢١ » بەردی زیادی هەبێ لە « ٥١ » بەردەکەی ئەوا ماڵێکی پێ ئەکڕێ‌و ئەو ماڵە ئەبێ بە « پوچ »ی ئەوو لە کاتی یاری کردنا چەند بەرد لەم پوچەدا کۆبێتەوە هەمووی بۆ خۆیەتی.

لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوەو بەردەکان بە سەر چاڵەکاندا دابەش ئەکەنەوەو ریزە لە کامیان بێ دەس بە یاری ئەکا وەکوو جاری پێشوو هەتا هەموویان یەکە یەکە زیچ ئەکەنەوەو ماڵەکانیش هەموو بەتاڵ ئەبن . ئەمجا هەر یەکەیان چاڵ‌و زیچ‌و پووچەکانی خۆیان کۆ ئەکەنەوەو ئەیـان ژمێرن . ئەوەی زۆری پێویست بوو چاڵ ئەفرۆشـێ ، ئەوەی کەمیشی پێویـست بوو سەلەم ئەکا ، ئەوانەی تریش کە زۆریان زیادبێ چاڵ ئەکڕن ، کەمیشیان زیادبێ بە سەلەم ئەیدەن بە پێویستەکان بۆ ئەوەی بۆ جارێکیتر کە هەمیشە پیویست بوو چاڵێکی پێ بکڕێ‌و لە سەر سەلەمەکەوە بۆی تەواو بکات .

هەمیشە لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوە هەر یەکێکیان هیچ چاڵێکی نەما هـەمووی بفرۆشـێت لە یارییەکە دەرئەچی. تاکو منداڵێکیان هەموو چاڵ‌و زیچەکان لە منداڵەکانیتر ئەکڕێتەوەو سەر ئەکەویت . جا لە سەر هەر شتێکیان کردبێ.

# ٢٤ ـ ساپ ساپێن

دوو منداڵ هەر یەکە بەردیکی پانو تەنك وەكوو ناو لەپ کەپێی ئەڵێن (ساپ) بە دەستیانەوە ئەگرن ، یەکیکیان ساپەکەي بە دەست دوور هەڵ ئەدا ، ئەوەی تریش لە جیگای خۆیەوە ساپەکەی بە دەست بۆ ساپی ئەو هەڵ ئەدا بە تین تاکوو ئەگەر لیشی نەدا لی‌ی دوور بکەویتەوە . ئەمجا منداڵەکەی پیشوو ئەچیتە جیگای ساپەکەی خۆیو هەڵی ئەدا بۆ ساپی منداڵەکەی‌تر ، بەم جۆرە هەر یەکیکیان لە ساپەکەی‌تر بدات سەر ئەکەوێ پیویستە منداڵە تی‌کەوتوەکە بە کۆڵ هەڵی بگری. چۆنیەتی هەڵگرتنەکەش ئەمەیە :

هەر دوو منداڵەکە بە پیوە ئەوەستنو پشتیان بە پشتی یەك ئەکەن ، تی‌کەوتووەکە هەردوو دەستەکانی لە ژیر هەنگڵی منداڵەکەی‌تر رەوان ئەکاو لە سەرەوە بۆ سەر شانیا بەرزیان ئەکانەوە . ئەمجا هەڵی ئەگریت بە کۆڵیاو پی‌یەکانی منداڵەکە لە زەوی بەرز ئەکانەوە هەتا ئەگاتە ساپەکەی .

دیسان لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە .

# ٢٥ ـ سنجوقین ( رەگ رەگانی )

سنجوق : داریکی ( بناو ° ) ـە وەکوو دار گەز یا بەژو ... هتد . بە ئەستورایی پەنجەو دریژ ایەکەشی دوو بست ئەبێ ، سەریکی تیژ ئەکرێ بۆ ئەوەی کە ئەی‌کوتن بەزەوی‌دا بچەقي .

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٢ ـ ٧ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٢ ) ساڵی‌دا ، هەر یەکە لە منداڵەکان قامکە سنجوقیك بە دەستیەوە ئەگرێ کە بۆ یاری بچیت .

منداڵەکان هەموو لە سەر زەوییکي نەرمدا کو ئەبنەوە بۆ یاری ، یەکیکیان سنجوقیکی خۆی لە سەر زەویدا ئەچەقیني ئەوانەی تریش یەکە یەکە سنجوقەکانی خویان ئەکوتن بە زەویدا لە تەك سنجوقەکەی یەکەم ئەی چەقینن . ئەگەر لە هەر جیگاییك سنجوقیك لە سنجوقەکەی یەکەمدا خشابێ ، یا لە هەر سنجوقیکی‌تر ا ئەوەی کە لە گەڵ لیدانیشدا بکەوێ پیویستە خاوەنەکانیان سنجوقیك بدەنە ئەو منداڵەی کە خستویەتی ، یا لی‌ی خشاندووە بەم جۆرە هەر یەکە سنجوقي لە خاوەنەکانیان وەر ئەگرێ . کە هەموو منداڵەکان سنجوقەکانیان ئەچەقینن ، منداڵەکەی یەکەمجار سنجوقەکەی هەڵ ئەکیشێو لە تەك سنجوقەکانی تردا ئەی دات

(°) داری سەنگین لە سەر رووی ئاو دابنریت ئەوبتە زیریەوە .

بە زەوی‌دا ، چەند سنجوقی لەگەڵ کوتانی سنجوقی خویدا خست یا بە چەندیکیانەوە نووسابوو هەر یەکە سنجوقی لە خاوەنەکانیان وەر ئەگرێ . بەم چەشنە منداڵی دووەم‌و سێیەم‌و چوارەمیش ... جا چەند منداڵی هەبن یەکە یەکە سنجوقەکانی خویان هەڵ ئەکیشن‌و لە تەك ئەوانی تردا ئەی دەن بە زەوی‌دا .

تا لە یاری تیر ئەبن ، جا هەر منداڵیك کە هەموو سنجوقەکانی دۆڕاندبێ بە دڵ ساردی لە یاری‌یەکە دەرئەچی ، یا بە هیلکە لی‌یان ئەکڕیتەوە ، ئەوەی کە سنجوقیکی زۆریشی بردبیتەوە هەمووی ئەباتە ماڵەوە ، یا بە هیلکە ئەیان فرۆشیتەوە

❁❁❁❁

# ٢٦ ـ سونە سونانی

ئەم یاری‌یە لە کاتی مەلەکردن لە ناو ئاودا ئەکرێ لە بەینی ( ٢ ـ ١٠ ) منداڵ لە تەمەنی ( ١٠ ـ ٢٠ ) ساڵی‌دا .

یەکیکیان ئەبێ بە سۆنە ، لە ناو ئاودا ئەگەڕی‌و خۆی گووم ئەکاو لە چنگی منداڵەکانی‌تر رائەکا بە مەلە ، ئەوانیش هەر یەکەیان ئەیەوێ خۆی بکا بە سۆنەو بە دووای سۆنەکەدا رائەکەن ، هەر یەکیکیان دەستی بە سەری سۆنە بکەوێ ئەبێ

به سۆنەو منداڵەکەی پیشی لە سونەیی ئەکەوێ . لە بەر ئەمە سۆنە تاکوو بتوانێ خۆی لە وانەیتر ئەپاریزێو خۆی نادا بە دەستیانەوە ، لە ناو ئاوا خۆی گووم ئەکاو لە ژیر ئاوا ئەڕوا تا لیٖیان دوور ئەبیتەوە ، کە نزیکی ئەبنەوە بە مەلە خۆی لە دەستیان دەرباز ئەکا . تا یەکیك ئەیگاتیو دەستی لە سەری ئەداو ئەبی بە سۆنە وە ئەوەی پیشوو لە سۆنەیی ئەکەوێ ، سۆنەی کۆنو ئەوانەیتر هەموو بە دووای سۆنەی تازە ئەکەون وە هیرشی بۆ ئەبەن بۆ دەست لە سەردانی . بەم جورە هەر یەکیکیان دەستی لە سەری سۆنە بدا ئەبی بە سۆنە ، تا لە ناو ئاوا دینە دەرەوە ئەمە پیشەیانە .

# ٢٧ .. سەری بە بن کلاو کەوتیە

جاری وا ئەبی منداڵیك کە بە دووای باوکیدا ئەگەڕێو نایدۆزیتەوە ، ئەچیتە ناو گوندی یا لە ماڵەکانی گەڕەکدا بە دووای باوکیدا ئەگەڕی لەو ماڵانە کە بزانی باوکی بە زووری هاتو چویان ئەکا ، یا ئەچیتە مزگەوت یا دیوەخانی گوندی . لە پیاوەکان ئەپرسی ، باوکم لە کوێیە ؟ ئەوانیش گاڵتەی پی ئەکەنو ئەڵین :

کوڕە نازانی باوکت سەری بە بن کلاو کەوتیە ؟ !.
منداڵەکەش ئەڵی : ناوەللاهی بە قەسەی وا دەڵین . گەورەکان سوێندی بو. ئەخون کە باوکیان دیوە سەری بە بن کلاو کەوتبو .

منداڵەکە ناچار باوەڕ ئەکاو بە گریانەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، کە دایکی بە گریانەوەی ئەبینی ئەڵی :
کێ لیێ داوە ؟. منداڵەکە ئەڵی : کەس لیمی نەداوە .
دایکی ئەڵی : ئەی بۆچ ئەگرییت ؟ !
ئەڵی : باوکم سەری بە بن کلاو کەوتیە ؟!.
دایکی ئەگرژێتەوەو ئەڵی : کێ وای پێ ووتی ؟.
منداڵەکە ناوی کابرای پێ ئەڵی کە وای ووتبو ، ئەمجا دایکی دڵی ئەداتەوەو ئەڵی کوڕم ئەی باوکت کلاوی هەر لە سەر نیە ؟. سەری هەر لە ژێر کلاوەکەیەتی ، بۆچی هەندە نەزانو نانێگەیشتی ؟. ئەمجا منداڵەکە دێتەوە سەر خۆیو لە گریان ئەکەوێ.

## ٢٨ سی ریزکانی

دوو منداڵ بەرانبەر یەك دائەنیشنو چوار گوشەییکی بە دریژایی ئەم پەڕاوە لە سەر زەوی دروست ئەکەن ، دوو دیڕ بە ناوەڕاستی ئەم چوار گوشەیەدا ئەکیشن ، ئەبێ بە چوار چوار گوشەی

وەکوو یەك . هەریەکە لە منداڵەکان سێ بەردی یەك ڕەنگ بۆ خۆی کۆ ئەکاتەوە بە مەرجێ ڕەنگی بەردەکانی هەریەکێکیان لە گەڵ بەردەکانی ئەوی‌تر جیابێ .

هەر یەکێکیان بەردەکانی ئەخاتە سەر دێڕەکانی ئەم چوار گوشانە . بە مەرجی هەر بەردی بکەوێتە سەر گوشەیێکی ئەم چوار گوشانەداو بەردەکانی هەر یەکێکیان لە سەر یەك دێڕ ڕیز نەبێ .

جا هەر یەکەیان هەوڵ ئەدا بەردەکانی لە سەر یەك دێڕ ڕیز بکا ، ئەوی تریش ڕێگای ئەگرێ‌و هەوڵی ڕیزکردنی بەردەکانی خۆی ئەدا . پێویستە هەر یەکەیان کە بەردەکانی خۆی یەکە یەکە لە جێگاییکدا ئەگوزێتەوە بۆ جێگاییکی‌تر لە سەر هیچ بەردیکی منداڵەکەی‌تر باز نەدا ، واتە کە بەردیکی ئەوی بکەوێتە پێش ناتوانی بەردەکەی خۆی بۆ لای ئەویان بیبا جا بۆ لاییکی‌تری ئەگوزی‌و بە نورە هەر جارەی یەکێکیان بەردیکی ئەگوزێ .

هەر یەکێکیان لە پێشا بەردەکانی خۆی لە سەر یەك دێڕ ڕیز بکا ئەو سەر ئەکەوێ‌و لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە .

❁❁❁❁

# ٢٩ ـ شەپلە قونانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی شـــەش منداڵ ئەکریٚ لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٢ ) ساڵی‌دا . دوو منداڵ لە سەر زەوی لە سەرگازی پشت دریژ ئەبن ، چوار منداڵەکەی تریش هــەر بە دووان یەکیك لە منداڵە دریژ بووەکان هەڵ ئەگرن ، هەر یەکیکیان بە هەر دوو دەستەکانی پی‌بەکۆ دەستیکی دریژبووەکە ئەگریٚو لە زەوی بەرزیان ئەکەنەوەو وەکوو جۆلانە بۆ پاش‌و پیش ئەیان هـەژیننەوە وەکو مەشکەی دۆ ، لە پڕ قوونی هەردووکیان لە یەك ئەدەن‌و هاوار هاواریان پی ئەخەن بەم چەشنە چەند جاریك لە ئـاسمانەوە قوونی هەردووکیان لە یەك ئەدەن لە گەڵ هەژاندنەوەکەدا . چەندی ئەم دوو منداڵە هەوڵ ئەدەن لە دەستی چوار منداڵەکەی‌تر رزگار نابن ، هەتا هەردووکیان دەس بە گریان ئەکەن یا یەکیان ئەگرییت لە بەر ئازاری لەشیان کە بەم جۆرە لە یەکیان ئەدەن ئەمجا بەریان ئەدەن‌و لە چنگیانا رزگار ئەبن .

# ٣٠ ـ شەررە بەرد

کە دوو منداڵ ، یا دوو تیپە منداڵ ، یا منداڵەکانی دوو گەڕەك ، یا منداڵەکانی دوو گوندی دراوسیٚ لە سەر شتیك ناخۆشیان ئەکەویتە بەینی لە یەك گیر ئەبن بە جنیوو شەڕ . لە یەك دوور ئەبنەوەو دەس ئەکەن بە شەڕە پەللارو بەرد

هاویشتن بۆ یەك .

ئەگەر شەڕەکەش گەورەبێ ، منداڵەکانی دوو گەڕەك یا دوو گوندبن ئەوا دار لاستیقو بەردەقانی ئەکەویتە کار ، هەر منداڵێك یەکێك لەم چەکانە یا هەر دووی لە گەڵ خۆیا هەڵ ئەگرێ لە کاتی شەڕ کردنیا . بەردە قانیەکە لە پشتی ئەبەستیو دار لاستیقەکەش ئەخاتە ملی . پێویستی بە کامیانەوە هەبێ ئەویان ئامادە ئەکاو بە دەستیەوە ئەگرێ لە کاتی شەڕدا .

کە لە یەك نزیك بن بە دار لاستیق شەڕ ئەکەن ، لە یەکیش دووربن بەردەقانی ئەکەویتە کار . تا بەشێکیان بەشەکەیتر ئەشکێنیو رایان ئەپێچنو تەنگەیان پی هەڵ ئەکەنو راویان ئەنێن بۆ گەڕەك ، یا گوندی بەشە شکاوەکە . جا چەند بریندارو سەر شکای لە هەردوو بەشدا ئەبێ ، دەسکەوتی هەردوو لاشیان ئەوەیە کە هەربەشێك منداڵیکی بەشەکەیتر بگرن ، چ دار لاستیق ، چ بەردە قانی لابیت لێی ئەستێننو لە گەل لێدانیشا مار کوژی ئەکەن ئەمجا بەرەڵلای ئەکەن .

تا بەم دووایەش شەڕە گەڕەك لە ناو شاری هەولێردا هەر مابوو بە تایبەتی لە بەینی تەلاتو تەیراوە . کە هەر جارەی تێك ئەگیران چەند حەفتەیەك درێژەی ئەکێشا ، هەر دوو لایان شکەستو بریندارێکی زۆریان ئەبوو ، چەند جارێکیش ئۆتۆمبێلی پۆلیسی چەکدار ئەهاتنە بەینیان بۆ پەرت کردنیان ،

بەلام بێ سوود بوو لە شەڕەکەی خۆیان نەئەکەوتن ، بەڵکو بۆ ڕۆژی پاشترێ دژتر ئەبوونەوە لە سەر شەڕەکە .

زۆر لە گەنجەکانیش بەشداریان ئەکرد لە شەڕی قەلاتو تەیراوە .

کە یەکی لە سەر قەلات ئەکەوتە خوارەوە تەیراوەییەکان ئەیان گرت هەر شتێکی بە کەڵکی لابوایە لییان زەفت ئەکردو زۆریشیان لی ئەدا ئەجا ڕەوانیان ئەکردەوە .

# ٣١ ـ شەڕرە بەفر

لە زستاندا کە بەفر زۆر ئەبارێ ، ( ٢ ـ ١٢ ) منداڵ ئەبن بە دوو بەش ، هەر یەکەیان چەند تۆپەڵە بەفرێ بە هەر دوو دەستەکانیان دروست ئەکەنو بۆ بەشەکەی تری ئەهاوێن تا هەموو لەشی یەك سپی ئەکەن لە گەڵ بەفرو بەشێکیان ئەشکێنو ڕائەکەن ، بەشەکەی تریش بە دووایانەوە . یا هەر دوو بەش بەرگری یەك ئەکەنو هەندە لە یەکتر نزیك ئەبنەوە پێزاناگەن تۆپەڵە بەفر دروست بکەن ، هەر یەکەیان بە هەر دوو دەستەکانی بەفری وورد وەکوو ئارد هەڵ ئەدا بۆ بەشەکەیتر تاکوو ماندوو ئەبنو لەشیان سپی ئەبێ لە گەڵ وورده بەفر .

گەورەکانیش زۆر جار لە کاتی بێکاری‌دا ئەم یاری‌یە ئەکەن بۆ رابواردن‌و خۆ گەرم کرنەوە بە هۆی جوولانەوەو راکردنیان ، کە زۆر خوشترە لە تۆپ تۆپێن‌و گورز گورزانێ .

❁❁❁❁

# ٣٢ ـ شەوتا

ئەگەر یەکی چەند شەوێ لە سەر یەك تایێکی گەرمی بێ‌و بە رۆژ وازی لی بینێ‌و بەری بدا . ئەو کابرایە شـــەوتای گرتووە ، خاوەنەکەی شەوێ چەند مندالی کۆ ئەکاتەوەو پی‌یان ئەلی : بڕون شەوتا بانگ بکەن بۆ نەخۆشەکەمان .

مندالەکانیش بە راکردن ئەچنە بەر دەرگای مالی پیاوێکی خاوەنی دوو ژن ( ئافرەت ) ، هەموو بە جارێ لە بەر دەرگاکەوە بە دەنگیکی بەرز هاوار ئەکەن :

شـەوتا

بە شەو ئەگرێ تا بە روژ بەر ئەدا

خودانی چوار چاو چ دەرمان ئەدا

چەند جارێ دوو بارەی ئەکەنەوە تا خاون مالەکە خواردنیك بۆ نەخوشەکە دیار ئەکا ئەلیت : گوشت مرشیك ، یا ئەلیت : گوشتی ئاژەل . کە خاوەنی چوار چاو ناوی خواردنەکە ئەلی ، مندالەکان هەموو بە هەیهاوو هاوار هاوار بۆ دەرەوەی ئاوایی

راثەکەن ، نەخۆشەکە ( شەوتا ) هەلەتە ئەکەن‌و لە نەخوشەکەی دوور ئەخەنەوە . ئەمجا ئەگەرینەوە بۆ مالی نەخوشەکەو لە دوورەوە بە دەنگیکی بەرز ئەلین : گوشت مریشك ، یا ئەلین : گوشت کاورر ، یا هەر گوشتیکی کە خاوەن دوو ژنەکە دیاری کردووە کە بە زۆری گوشت مریشکە لە بەر ئەوەی بە ئاسانی لە گوندەکانا هەموو کەسێ چنگی ئەکەوێ .

جا کە وەلامەکەیان بۆ ئەبەنەوە ، خاوەنی نەخوشەکە ئەم گوشتەی کە خاوەنی چوار چاو دیاری کردووە ئەکەن بە شیوو دەرخواردی نەخوشەکەی ئەدەن تا بۆی بێ بە شفا .

# ٣٣ ـ شەوی شەو بەراتی

هەموو سالی لە شەوانی شەو بەراتدا ، پۆل پۆل مندال کۆ ئەبنەوەو هەر پۆلی رووی لە گەرەکیك ئەکرد ، بە کولانەکاندا ئەگەرران‌و مال بە مال لە بەر دەرگاکان ئەوەستان‌و ئەیان ووت :

شەوە شەوی شەو بەراتێ
خوا دوو کوڕو کچیکتان بداتێ
خاتوونی سەر بە زێرێ دەس لە کەندووان بگێرێ
بەشی مندالان بنێرێ

کابانی هەر ماڵێکیش چنگە قەسپێك ، یا چنگە میوژێك ، یا هەر خواردنێکی‌تر ئەدا بە منداڵەکان . جاری‌وا ئەبێ کچێك شتەکە ئەدا بە منداڵەکان ، چەند منداڵێکی ئاڵچاغ پولەدا ئەبێ پێی ئەڵێن :

خوا مێردێکی جوانت بداتێ
لە جوانیدا کەس نەی گاتێ

کچەکەش شەرم ئەی‌گرێت‌و بە توڕەیی جنێو بە منداڵەکان ئەدا . بەم جۆرە هەر تاخمەی خواردنێکی زوریان کۆ ئەکردەوەو لە گەڵ یەکا ئەیان خوارد .

# ٣٤ ـ قورت قورتانی ( چاڵێن )

لە بەینی ( ٢ ـ ٨ ) منداڵ ئەکرێ کە قوڵتێکی بە قەدەر دوو گۆلم لە زەوی‌دا ئەکۆڵن ، یەکێ لە منداڵەکان ئەبێ بە سەرکارو لە نزیك قوڵتەکەدا ئەوەستێ ، یا دائەنیشێ . منداڵەکانی تریش دوو هەنگاو دوور لە قوڵتەکە قزگەیێك ئەکەن ، لە سەر هەر شتێك یاری بکەن چەند دانەیەك لەو شتە لە قزگەکەوە بە دەست بە جارێ هەڵ ئەدەن بەم جۆرە بە ریزە یەك لە دووای یەك . جا بەڕوو یا کەللا یا گوێز یا هەر شتێکی تر بێ .

لە گەڵ هەڵدانەکەدا چەند دانە لە شتەکە بکەویتە ناو قوڵتەکە ئەیژمیرن . ئەگەر جووت بێ ئەوەی هاویشتوویەتی هەند جووتە لە منداڵەکەی سەر قوڵتەکە وەر ئەگرێ جگە لەوانەی هەڵی داون کە بۆ خۆی کۆیان ئەکاتەوە ، بەڵام تاك بێ ئەوا چەندی کەوتبیتە ناو قوڵتەکە هەمووی بۆ منداڵەکەی سەر قوڵتەکەیە .

ئەگەر سەرکارەکەش هەموو شتەکانی خۆی دۆڕاند کە یاری لە سەر ئەکەن و هیچی لا نەما ئەوا لە یاری‌یەکە دەر ئەچێ و یەکی‌تر لە یاری‌کەرەکان جیگاکەی ئەگریتەوە .

# ٣٥ ـ قومەت قومەتانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٦ ـ ٢٠ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ١٠ ـ ٢٠ ) ساڵی‌دا . منداڵەکان ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، ئەم دوو بەشە ( هۆپ هۆپ قەرەتۆپ ) ئەکەن ئەوەی تێ بکەوێ لە جیگاکەی خۆیا ئەمینیتەوە ، بەشەکەی‌تریش ئەچن لە ناو گەڕەکەکانا ئەسوڕینەوەو هەر جیگایێکی خۆڵ یا کای زۆر بێ بە پەلە چەندەها قومەتی لی ئەکەن کە هەر یەکە هەندی لەپێك ئەبێ ، بەم چەشنە لە کاولیك ئەچنە کاولیکی‌تر یا لە سەر ریگاکانا کە خۆڵی زۆر بێ ، بە پەلە تا بتوانن زۆر

لەو گومبەتە بچووکانە دروست ئەکەن . ئەمجا ئەگەڕێنەوە بۆ لای بەشەکەی‌ترو لە گەڵیانا ئەگەڕێن بەم شوێنانەی کە قۆمەتیان لێی کردووە بەبێ ئەوەی پیشانیان بدەن بەڵکو دەس خەڵەتیشیان ئەدەن . بەشەکەی تریش هەر جێگاییك کە هەستی پێ بکەن قۆمەتی لێ کراوە بە پێی قۆمەتەکانی تێك ئەدەن‌و بزریان ئەکەن. تا بتوانن ئەگەڕێن ، کە وازیان لە گەڕان هێنا بەشەکەی‌تر ئەم قۆمەتانەیان پیشان ئەدەن کە درووست کراوون‌و نەدۆزراینەوە . یەکە یەکە ئەیان ژمێرن‌و بە ژمارەی قۆمەکان ژمارەیان بۆ دا ئەنرێت‌و لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوەو بەشەکەی‌تر ئەچنە ناو ئاوایی بو قومەت کردن بەشێ یەکەمیش لە سەر قزگەکە ئەمێنیتەوە ، بەڵام چەند قومەتیان لە سەر بەشەکەی‌تر هەبێ هەر بویان ئەژمێردرێ .

کە بەشەکەی‌تر لە قومەت کردنا ئەگەڕێنەوە ئەم بەشەش ئەچن بە دووای قومەتەکانی ئەواندا ئەگەڕێن وەکوو جاری پێشوو بەم جورە هەر جارەی بەشێ دائەنیشێ‌و بەشەکەی‌تر ئەچنە قومەت کردن ... تا لە یاری تێر ئەبن .

کام بەش ژمارەی ئەم قومەتانەیان زۆرتر بێ کە بەشەکەی‌تر نەیان دۆزیوەتەوە ، ئەم بەشە سەر ئەکەوێ‌و بەشەکەی تریش تێ ئەکەوێ .

# ٣٦ ـ کلاو پشت قونانی

( ٦ ـ ٢٠ ) منداڵ بازنەیی بەرانبەر یەك دائەنیشن کە هەر یەکەیان هەنگاویك لەوی تەنیشتی دووربی . تەنیا منداڵیك نەبی ئەویش تی ئەکەویٚو لە پشت منداڵەکانا ئەسوڕێو کلاویکی بە دەستیەوە ئەگریٚ ، لە پڕ کلاوەکە لە پشت یەکی لە دانیشتووەکاندا ئەخاتە سەر زەویو لە سوڕانەکەی خوشی هەر ناکەویٚ ، ئەگەر دانیشتووەکە زوو زانی کە کلاوەکەی لە لە پشتیدا دانراوە ، کلاوەکە بە دەستیەوە ئەگریٚو بە دووای ئەوەی تردا رائەکا کە لە پشتیەوە دایناوە ، ئەگەر گرتی پیش ئەوەی بگاتەوە جیگاکەی خوی کە کلاوەکەی لی فڕیٚ درابوو ئەوا سواری پشتی ئەبی تا ئەگاتەوە جیگاکەی خوی لەو جیگایەوە کە ئەیگریٚ ، بەلام ئەگەر منداڵەکەیتر سوڕایەوەو چوو لە جیگای ئەودا دانیشت ئەوا منداڵە جی گیراوەکەش کلاوەکە بە دەستیەوە ئەگریو لە پشت منداڵەکاندا ئەسووڕیتەوەو لە پڕ کلاوەکە لە پشت یەکیك لە دانیشتووەکاندا ئەخاتە سەر زەویو هەر ئەسووڕیت .

جاریوا ئەبی ئەو منداڵەی کە کلاوەکەی لە پشتیدا دانراوە هەست پی ناکا تا منداڵەکەیتر بە دەوری هەموو دانیشتووەکاندا ئەسووڕیتەوەو ئەگاتەوە جیگای کلاوەکە . ئەو منداڵەی کە کلاوەکەي لە پشتیدا دانراوە پیویستە ئەوەیتر

هەلبگری تا لە پشت هەموو دانیشتووەکاندا ئەی سوڕڕینیتەوەو ئەی باتەوە جیگاکەی خوی کە کلاوەکەی لە پشتیدا دانرابوو ، کلاوەکەش بە دەستیەوە ئەگری‌و بە دەورەی دانیشتووەکاندا ئەسوڕریتەوە لە بەر ئەوەی جیگاکەی گیراو ئەویش وەکوو ئەوانەی پیشوو کلاوەکە لە پشت یەکیك لە دانیشووەکاندا ئەخاتەوە سەر زەوی‌و ...

❁❁❁❁

# ۳۷ ـ کلاو قشپلانی

دوو مندال لە بەرانبەر یەکا دائەنیشن‌و ( ١٥ ) دانە قشپل کو ئەکەنەو ، یەکیك لەم قشپلانە تا نیوەی ئەڕرنن کە پی‌ی ئەلین ( مەلا ) . هەموو قشپلەکان ئەخەنە ناو کلاویك ، کلاوەکە بە قشپلەوە دەونخون ئەکەنەوە سەر زەوی ، یەکیکیان دەس بە یاری ئەکاو لە سەرخو کلاوەکە لە سەر زەوی‌دا بەرز ئەکاتەوەو قشپلەکان لە سەر زەوی ئەمیننەوە ، قشپلەکان یەکە یەکە بە پەنجەیکی لە کومەلە قشپلەکەدا دوور ئەخانەوەو هەلیان ئەگریتەوە ، بە مەرجی مەلا لە جیگاکەی خویدا نەجوولیتەوە ، ئەگەر مەلا بجولیتەوە یاری کەرەکە لە یاری ئەکەویت‌و مندالەکەی‌تر لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکاتەوە تا ئەویش بە جولانەوەی مەلا لە یاری ئەکەوی‌و مندالەکەی پیشو دەس بە یاری ئەکانەوە . هەر یەکیکیان لە کاتي یاری کردنا چەند

قشپلی هەل گرتبیتەوە پیش ئەوەی مەلا بجولیتەوە ، کە لە یاری کەوت هەندەی بو ئەژمیردری‌و کامیان لە پیشا ئەو ژمارەی تەواو کرد، کە لە پیشا قسەیان لە سەر کردووە کە بەزوری لە ( ١٠٠ )ە ئەویان سەر ئەکەوی ، یا هەر یەکیکیان هەموو قشپلەکان هەلبگریتەوە بەبی ئەوەی مەلا لە جیگاکەی خویدا بجولیتەوە ، ئەمجا مەلاش بە جوریکی تایبەتی هەل ئەگری کە رووی پەنجەی گەورەی ئەخاتە سەر پشتی مەلاو نەختی بە هیز دای ئەگری تا مەلا بە پەنجەکەیەوە ئەنووسیت . ئەمجا دەستی لە زەویدا بەرز ئەکاتەوەو مەلاشی هەر پیوە نووساوە ، مەلا ئەخاتە ناو دەستەکەی‌تری کە هەموو قشپلەکانی‌تری تیدا کو کردووەتەوە . ئەمجا سەر ئەکەوی بەبی ئەوەی ژمارەکەش تەواو بکا .

# ٣٨ ـ کەری بەقالان ( دیوەرە )

دیوەرە : ئەم بەقالە بوو کە وولاخیک ، یا کەریکی شیشکت بار ئەکرد لە جورەها پیویستی دیهاتەکان ، لە پیویستی ناو مال ، شیرنانی‌و خواردەمەنی خوش ، کە دەستەی یاری مندالان ، ووردە جل‌و جورر ، بازن ئەموستیلەو موری‌و زەنگیانە ... هتد .

که ئەگەیشتە هەر گوندی ژنو پیاو ، کوررو کچ ، گەورەو بچووك لە وولاخەکەی کو ئەبوونەوە بو کرینی ئەم شتانە بە پارەو هیلکە ، یا گەنمو جۆ ، یا خوری‌و پەتە .

بەقالەکە ئەم شـتانەی کە هەیەتی بە ئاوازیکی خوش لە سەر خۆ یەکە یەکە ناوەکانیان ئەلی‌و دریژەی پی ئەدا ، ئەلی دیوەرە بازن ، دیوەرە ئەنگوســـتیلە ، دیوەرە شەقشەقە ، دیوەرە حەلوا ، دیوەرە ... بە پارە بە هیلکە بە ... ئەگەر پیویستیشی تەنیا بە هیلکەبی ئەوا بە پارەو بەو شتانەی هەیەتی هیلکە وەرئەگری‌و ئەلی : پارە بە هیلکە ، شقانە بە هیلکە ، حەلوا بە هیلکە .. هتد .

بە تایبەتی هەموو شتەکانی بەقال بو مندال ســـەرنج راکیشە . لەبەر ئەوە مندالەکان لاسای ( دیوەرە ) کە ئەکەنەوە دوو مندال یەکیکیان لەپشت ئەوەی تردا دائەچەقیتەوە ، شتیك ئەخەنە ســـەر پشتی‌و سەر سەری وەستاوەکە ، یەکیکیش لە مندالەکانی‌تر ئەبی بە بەقال سەری ( کەرەکە ) منالە وەستاوەکە ئەگری کە مندالەکەی‌تر لە پشتیەوە خوی چەماندووەتەوە . بە ناو مندالەکاندا ئەگەڕی‌و لاسای بەقال ئەکاتـــەوە ، مندالەکانیش لی‌ی کو ئەبنەوەو معامەلەی لەگەل ئەکەن هەر وەکوو کرینی شت لە بەقال ، بە شیوەیکی لاسایی .

ﮋﮋﮋﮋ

# ٣٩ ـ کەری پشت درێژ

( ٦ ـ ١٢ ) منداڵ تیدا بەشـــدار ئەبن لە تەمەنی ( ١٠ ـ ١٤ ) ساڵیدا ، ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، هەر بەشی سەردارێکیان هەیە ، ئەو دوو سەردارە ( هۆپ هۆپ قەرەتۆپ ) ئەکەن ، کامیان بدۆڕێنی لایەنگیرەکانی [ دائەچەقینەوە ° ] ســـەرۆکەکەشیان بە دەوریانا ئەسوڕێتەو پاریزگاریان ئەکا ، بەشەکەیتریش هەوڵ ئەدەن لە هەڵکەوتا سواری پشتی داچەقاوەن بین . سەرداری داچـەماوەکانیش بەرگرییان ئەکاو لەقەیان بۆ ئەوەشینی بۆ پاراستنی هاوبەشەکانی . ئەگەر لەقەی لە هەر یەکیك دا پیش ئەوەی خوی هەڵ بداتە ســـەر پشتی داچەقاوەکانو سەردارەکەش دەستی لە هاوبەشەکانی بەرنەدابێ . ئەوا بەشەکەیتر تیئەکەونو داچەقینەوە کە لەقە لە یەکێ لە هاوبەشەکانیان دراوە بەشە رزگار بووەکەش لە هەڵکەوتا خویان هەڵ ئەدەن بۆ سەر پشتی داچەمـاوەکانی تازەدا . هەر یەکیك خوی هەڵبداتە سەر پشتی داچەقاوەکانو پێیەکانی لە زەوی بەرز بێتەوە ، سەرۆکی داچەماوەکان لەقەشی لی بدا هیچ کار ناکا لە بەر ئەوەی پیی لە سەر زەویدا نەماوە .

---

(°) یەکێکیان لە پیشەوە هەر دوو دەستی خوی بە دیواریکەوە ئەگریو بە پیوە ئەوەستی ئەوانەی تریش لە دووای ئەوا یەکە یەکە ریز ئەبنو سەریان بە پشتی یەکەوە ئەکەن .

جاری وا ئەبێ بەشەکەی‌تر هەموویان یەکە یەکە خۆیان هەڵ ئەدەنە سەر پشتی تێکەوتووەکان ەبێ ئەوەی لەقەیان لێ بدرێت . سەرۆکی داچەقاوەکان ناچار لە دیاریاندا ئەوەتی ، ئەوانیش لە سەر پشتی هاو بەشەکانیدا خویان توند ئەگرن و ناتوانێ لەقە لە هیچێکیان بدا ، لە بەر ئەمە چاوەروانی ئەوە ئەکا یەکێکیان بکەوێتە خوارەوە ئەمجا لەقەی لێ بدا ، بەلام بێ سوودە هیچێکیان ناکەونە خوارەوە تا منداڵە داچەماوەکان ماندوو ئەبن و ئەکەون ئەمجا دێنە خوارەوە کە سەردارەکە مافی ئەوەی نامینی لەقە بوەشینی لە بەر ئەوەی هاوبەشەکانی خۆی کەوتن . لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوەو دووبارە داچەقاوەکانی پیشوو دائەچەمینەوە چەنکو سەردارەکەیان لەقەی لە کەسیکی بەشەکەی‌تر نەداوەو خۆشیان رووخابوون . ئەوانەی تریش خویان بۆ سەر پشتی داچەقاوەکان هەڵ ئەدەن تا سەرداری داچەماوەکان جاریك لەقە لە یەکێکیان ئەدا ئەمجا رزگار ئەبن و بەشەکەی‌تر تی ئەکەونو دائەچەقینەوە .

## ٤٠ ـ کیشمانە کیش ؟

گەورەکان ئەم یاری‌یە لە گەڵ منداڵەکاندا ئەکەن ، گەورەکە بە هەردوو دەستەکانی هەر دوو گۆی منداڵەکە ئەگرێ بە پەنجەی گەورەو دۆشاوەژ ەی ، بە منداڵەکە ئەڵی : کیشمانە کیش؟

ئەگەر منداڵەکە ووتی : کێی فەقیران رامەکێش ئەوا رزگار ئەبێ‌و گەورەکە گۆیەکانی بەر ئەدا ، بەلام ئەگەر منداڵەکە وەلامەکەی نەزانی گەورەکە بەم پرسیارانە ئازاری ئەدا . پێی ئەڵی : دەچیە سەرداری یا دێ‌یە خواری؟. کە منداڵەکە بڵێت ئەچمە سەرداری گەورەکە بە توندی هەردوو گۆیەکانی منداڵەکە بۆ سەرەوە بەرز ئەکاتەوەو منداڵەکەش لە بەر ئازاری گۆیەکانی دەس بە هاوارو گریان ئەکا ، کە منداڵەکە ئەم جارە لە ترسا بڵێ دیمە خواری گەورەکە هەر دوو گۆی منداڵەکە بۆ خوارەوە رائەکیشێ . کە بۆ سێهەمین جار پرسیارەکەی لێ ئەکاتەوە ، منداڵەکە چاوترسای ئەبێ‌و هیچ وەلامی ناداتەوە لە گریان زیاتر . ئەمجا گەورەکە پرسیارەکەی یەکەم جاری بۆ دوو بارە ئەکاتەوەو ئەڵێ : کیشمانە کێش ؟. ئەگەر وەلامی دایەوە ئەوا رزگار ئەبێ ، ئەگینا ئەوا هەر بە پرسیارەکەی‌تر ئازاری ئەدا تاکوو یەکێ لە دانیشتووەکان وەلامی پرسیارەکەی یەکەم بە منداڵەکە ئەڵێ ، منداڵەکە ئەمجا وەلامی گەورەکە ئەداتەوەو رزگار ئەبێ لە چنگیا .

# ٤١ ـ گلولە موو

دوو منداڵ ، یا دوو گەنج . یەکیکیان لە سەر زەوی دائەنیشێ ئەوەی تریش لە پشتیەوە خۆی بە سەریدا خوار

ئەکاتەوە تا سەری ئەگاتە نزیك ناوکی دانیشتوەکە ، ئەویش لە ژێرەوە وەکوو ئەو ئەکاو پڕدینی ئەگرێو خۆی گلۆل ئەکاتەوە ، جا هەر یەکێکیان کە ئەکەوێتە سەر زەوی تەکان ئەداتە خۆیو تا وەکوو گلۆلە ماوەیێکی دوور لە سەر زەوییدا ئەڕۆنو غل ئەبنەوە بە سەر یەکدا .

# ٤٢ ـ گوریس کیشکانی

ئەم یارییە لە بەینی ( ٦ ـ ١٢ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ١٠ ـ ٢٠ ) ساڵیدا ، یەکێکیان سەری چوار گوریس یا زیاتری لە ( تەنکە )ی وانە ناوقەدی کە جێگای پڕدینە . گرێ ئەدەن ، سەرەکەی تری گوریسەکانیشی لێ دوور ئەخەنەوە ، یەکێ ئەبێ بە پاریزگاری تێکەوتووەکەو گورزێك بە دەستیەوە ئەگرێ . منداڵەکانی تریش کە بۆیان هەڵکەوێ هەر یەکە لە لایێ سەرێکی ئەم گوریسانە ئەگرنو بە هێز رای ئەکێشنو هەر جارەی گوریس لە پشتەکە بە لاییکدا رائەکێشن ئەی خشێنن بە سەر زەوییدا چەنکو سەری گوریسەکانی پشتی هەر یەکە بە لاییکدا پەرت کراوون . پاریزکارەکەش هەول ئەدا بە گورزەکەی دەستی لە یەکێك بدا لەوانەی کە تەشقەڵە بە گوریس لە پشتەکە ئەکەن ، جا ئەگەر لە هەر

یەکیکیا بی‌دا ئەوا گورز لی‌دراوەکە تی‌ئەکەوبت‌و سەری گوریسەکانی لە پشتی ئەخەن ئەوەی پیشووش رزگارئەبی ـ لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوەو تی‌کەوتووە تازەکە ئازار ئەدەن‌و بەم‌لاو بەولادا رای‌ئەکیشن تا شـل‌و کوتی ئەکەن . یا پاریزەرەکەی گورز لــــە یەکی ئەداو گورز لی‌دراوەکە تی‌ئەکەوی‌و جیگای ئەگریتەوەو ئەم کارەساتەش بە تیکەوتووی نوی ئەکەن .

# ٤٣ ـ گی‌فرکانی

یەکیکی گەورە چەند مندالیك بە دەورەی خویدا کۆ ئەکاتەوە گی‌فڕکانی‌یان پی‌ئەکا بەهۆی خواردنیکی خوش کە هەر جارەی پارچەیی لەم خواردنە دوور هەل‌ئەدا ، هەریەکە لەمندالەکان بە پـەلە بۆ خـواردنەکـە ئەچی بیگریتـەوەو بە زووترین کات بیگەڕینیتەوە دەست گەورەکە پیش ئەوەی مندالەکانی‌تر بیگرن ، ئەبی بە خوراکی ئەو .

بەلام ئەگەر هەر مندالی خواردنەکەی لە زەوی‌داهەلگرتەوەو پیش ئەوەی بیگەیەنیتەوە دەست گەورەکە مندالەکانی‌تر بیگرن ئەوا هەر یەکەیان بابایە گوبی ئەکری‌و رای ئەکیشی ، گەلیك ئازاری ئەدەن تا بە هەرحالی ئەی گەیەنیتەوە دەست گەورەکە ئەمجا

بەری ئەدەن و ئەخوا .

کابرا پارچەییکی تر لە خواردنەکە هەڵئەدا ، هەریەکی ییکریت وگی قژکانی پی بکرێ خواردنەکەی لی ئەبی بە سندان و قوزەڵقورت لەبەر ئازاری گوێیەکانی .

# ٤٤ ـ میش گره

لە هاوین دا کـــە زەردەواڵە زۆر ئەبووو بە جووڵە ئەکـەوتن ، جۆگەلە ئاوەکانی هەر بیریك چەند مندالیکی بە دەورەیدا کۆئەبوونەوە . هەر یەکەیان چەند داوە موویکی لە کلکی وولاخیکدا هەڵ ئەکیشاو چەند کەڵە قەسەلیکی بە دریژایی پەنجەی نیوانیشی بە دەستیەوە ئەگرت ، هەر داوە موویکیان بە دووقەدی ئەخستە ناو کەلە قەسەلیکەوە ، هەردوو سەری مووەکە لە سەرەکەی تری قەسەلەکەوە دەرئەچوو سەرەکەی تریشی ئەبوو بە کەوانە ، بە دەستیك ناوەراستی قەسەلەکەی ئەگرت و بە دەستەکەی تریشی هەردوو سەری داوە مووەکەی ئەگرت ، لەسەرخۆو بە زانایی کەوانەی مووەکەی بۆ ژیر سکی زەردەواڵەیەك راپیش ئەکردو لە پڕ هەردوو سەری مووەکەی رائەکیشا . زەردەواڵەکە ئەکەوتە بەینی داوەکەو سەری قەسەلەکە،

منداله‌که هه‌ردوو سه‌ری مووه‌که‌ی گرێ ئه‌داو که‌له پووسی ، یا که‌له قه‌سه‌لیکی بچووکی ئه‌خسته به‌ینی قه‌سه‌له‌که‌و گرێی داوه‌که ، به‌م جۆره زه‌رده‌واله‌که له که‌وانه‌که‌دا به‌ندئه‌بووو توانای ده‌رچوونی نه‌ئه‌بوو .

به‌م چه‌شنه منداله‌که زه‌رده‌واله‌که‌ی هه‌ڵئه‌دا بۆ ئاسمان و داوه قه‌سه‌له‌که‌شی هه‌ر به‌دووایه‌وه ، له‌به‌رئه‌مه به فڕین له چنگی رزگار نه‌ئه‌بوو وه که نه‌ختێ لێی دوور ئه‌بووه‌وه به دووایا رای‌ئه‌کردو ئه‌ی‌گرته‌وه .

## ٤٥ ـ ویلی ویلی

ئه‌م یاری‌یه له به‌ینی دوو منداڵ ئه‌کرێ له ته‌مه‌نی (٧ ــ ١٢ ) ساڵی‌دا . به‌ردیکی خڕ ئه‌که‌ن به گۆ ، هه‌رجاره‌ی یه‌کیکیان ده‌س به یاری ئه‌که‌ن‌و به به‌ردیکی پان له به‌رده خڕه‌که ئه‌دا بۆ جیگاییکی دیار کراوه له‌ویشه‌وه به‌م جۆره ئه‌ی‌گیریته‌وه بۆ جیگاکه‌ی پیشووی ، هه‌میشه ئه‌یباته‌وه‌و ئه‌ی‌گیریته‌وه چه‌ندجارێ تاکوو جاریك که به‌رده‌پانه‌که بۆ گۆیه‌که ئه‌هاوێ‌و پێی‌ناکه‌وێ ئه‌مجا له یاری ئه‌که‌وێ‌و منداله‌که‌ی‌تر ده‌س به یاری ئه‌کا هه‌ر وه‌کوو ئه‌وه‌ی پیشوو .

یاری کەرەکـە هەرجارەی کـە بەردەکە بۆ گویەکە ئەهاوێ دیریك لەم هەلبەستە ئەلی :

ویـلی ویـلی
دوو سـمبلی
سـمیل قیتـە
بـە جـلیتـە
حـلیت بـازە
لـە هـەورازە
هـەوراز قـازە
قـاز بەرازە

هەر ئەرواو ئەم هەلبەستە دووبارە ئەکاتەوە تا جارێ بەردەکە ئەهاوێو لە گویەکەی نادا وە لە یاری ئەکەوێو منداڵەکەیتر دەس بە یاری ئەکا ، هەریەکیکیان کە سووتاو لە یاری کەوت ، چەندجار گویەکەی گەیاندیتە جیگا دیاوکراوەکەو گیرایەوە منداڵەکەیتر هەلی ئەگریت بەکـوڵ بـۆ جیگا دیار کراوەکەو ئەیگیریتەوە . ئەمجا لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوە . منداڵەکەیتریش هەر بەم چەشنە .

# ٤٦ ـ هوپ هوپ قەرە توپ

ئەم یاری‌یە پەیوەندی بە زۆر لە یاری‌یەکانی‌ترەوە هەیە وەك ( پەلیکانی ، چاو شارکی ، قۆمەت قومەتانی ، کەری پشت‌دریژ ، کیلەبەردانی ... ) . کە سەرداری هەردوو بەشەکان ، یا ئەگەر تەنیا دووکەس‌بن ئەم یاری‌یە ئەکەن بو ئەوەی بزانن کام‌بەش تی‌ئەکەوێ .

هەردوو مندالەکە لەیەك دوور ئەبنەوەو بەرانبەر یەکا رائەوەستن ، کامیان زووتر لە جیگاکەی خوی‌دا راوەستا بە مندالەکەی‌تر ئەلی : هوپ هوپ قەرە توپ ، مندالەکەی‌تریش لە جیگاکەی خویدا ئەوەستی تا ئەمەیان سێ پی بوی ئەچیتەپیشەوە واتە سەری پەنجەی پییەکی لەگەڵ قوونپانی پی‌یەکەی‌تر بە دریژی بەدووای یەکا ریز ئەکا ، بەم جورە پی‌یەکەی پاشەوەش ئەگوزیتەوەو ئەیخاتە پیشەوەی ئەم پی‌یەی ، تا بەم جورە سێ پی بوی ئەچیتە پیشەوە ، لەگەل گواستنەوەی هەر پی‌یەکیشی دیریك لەم هەلبەستە ئەلی :

ئەمن لەم‌بەری زی
ئەتوو لەوبەری زی
لە ملت دەکەم زریزی
هەتا پایزی .......

که سی پی بوی چووه پیشەوە لە جیگای خویدا ئەوەستی‌و منداله‌کەی‌تریش وەکوو ئەو سی‌پی بوی دیتە پیشەوەو لەگەل هەر پی هاویشتنیکدا دیریك لەم هەلبەستە ئەلی کە وەلامی مندالەکەی تر ئەداتەوە :

هەلت دەگرم دات دەنیم
لە ناو جوزکی کات دەنیم
هەتا دەمری ..... .....

کە ئەو مندالەش سی پی دیتە پیشەوەو لە جیگاکەیدا ئەوەستی ، ئەوەی‌تر سی پی‌ی‌تریش دیتە پیشەوەو جورە هەلبەستیکی‌تری لەگەلدا ئەلی . ئەمجا ئەوەی‌تریش سی‌پی بوی دیتە پیشەوەو بە هەلبەست وەلامی ئەداتەوە بەم جورە تا هەردوو مندالەکە پی‌یەکانیان ئەگاتەوە پی‌ی یەکو لەیەك ئەخشین جا لە کاتی رویشتنی کامیان‌بی ئەو سەرئەکەوی‌و وەستاوەکە تی‌ئەکەوی .

# ٢ـ یاری یەکانی کچانە

## ١ ـ بووکوکە

کچیك یا چەند کچی لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٢ ) سالیدا کە بیانەوی بووکوکەیێك دروست بکەن ، داریکی بە دریژایي بستیك ، داریکي بە دریژایی دوو گرێی لە سەری ئەپیچن راستو چەپ کە وەکوو سەلیبي لی دی ، چەند پارچە پەڕوکیکی لە دەورەیدا دەئالینن‌و ئەبی بە سەرکی بووکوکە ، بە دریژایی پەنجەیێ لە خوارەوەی ئەم سەرکە داریکی بە دریژایی پەنجەی نیوان هەمیشە راستو چەپ لەگەل دارە دریژەکەدا ئەپیچن‌و تیلمە پەڕوی پیو دەئالینن‌و ئەیکەن بە هەردوو دەستی بووکوکەکە ، لەپاشان پەڕو لە هەموو لاشەی بووکەکە ئەپیچن‌و ئەستووری‌ئەکەن .

ئەمجا جلی بووکینی‌ی لەبەرئەکەن ، سەرکلاوو دەسرۆكو هیزاری لە سەری ئەپیچن ، توڕ یا سەرکەلەی لە پشتی ئەپیچن، دوو تیلمە پەرۆش ئەکەن بە ئەنگوچکی کراسەکەی‌و لە هەردوو دەستەکانی ئەپیچن‌و ئەنگوچکەکانی شوڕ ئەبیتەوە ، دەسمالیکیش ئەخەنە سەر سەری وە ئەبی بە بووکیکی رازاوە . ئەمجا گورانی بو ئەلین :

بووکانـە  بووکانـە  بووکێ
بووکمان گەلەك جووانە بووکێ
بە مۆری‌و مەرجانە بووکێ

بەم جۆرە هـەر چینێ بە سەر بووکۆکەکەی خۆیاندا ئەڵێن‌و سووقي ئەو کچانەی پێوە ئەکەنەوە کە بووکۆکەیان نی‌یە.

ﻫﻫﻫﻫﻫ

# ٢ ـ بەنتك

کە لە هـەر مـاڵێ پرتەقاڵ یا لیمۆ بخورابوایە ، کچە بچکۆلەکان پەلکەکانیان کۆ ئەکردەوە هەموویان ئەکرد بەپارچەی بچووك بچووك ، هەر پارچەی بە قەدەر قوپچەیێکی بچووك ، چەند داوە دەزوویکیان ئەهینا هەر یەکەی بە دریژایی پەنجەییك ئەم پارچانەیان وەکوو دەنکە تەزبیح بە داوەکانەوە ئەخست‌و ئەیان کردن بە بەنتك ، سەری چوار پینج بەنتکیان بە یەکەوە گرێ ئەداو بەزیێ (یاخە)ی خۆیانەوەیان ئەخست بە هەر دوو لا یەخەی کورتەکیانەوە ئەدرووی. هەر ووها سۆتکەو قەنەفلیان لە دایکیان ئەستاندو ئەیان کرد بە بەنتك ، هەموویان بە ریزە ئەدرووی بە هەر دوو لا یاخەی کورتەکیدا کە بۆنیکی خۆشی

سۆتکەو قەنەفڵو پرتەقاڵو لیمۆی لێ ئەهات ، کچەکە زۆر شانازی پیانەوە ئەکرد . جاریوا ئەبوو یەك دوو جووتیشی لەم بەتکانە بە دیاری پێشکەش بە دەستە خوشکێکی زۆر خۆشەویستی ئەکرد کە زۆر بەم دیاری‌یە شادمانو خۆشحاڵ ئەبوو .

❁❁❁❁

# ٣ ـ پێنجَوکانێ

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٢ ـ ٥ ) کچ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٨ ـ ٢٠ ) ساڵی دا . پێنج بەردی بە قەدەر هێلکە کیشکە کۆ ئەکەنەوە ، تەزو هیشکانێ ئەکەن لە سەر ئەوەی کامیان لە پێشا دەس بە یاری بکا ، سەرکەوتووەکە دەس بە یاری ئەکاو یەکێك لە بەردەکان بە دەستیەوە ئەگرێو بەردەکانی تریش هەل ئەداتە سەر زەوی ، بەردەکەی دەستی بۆ ئاسمان هەل ئەداتو بەردێك لە سەر زەوی هەل ئەگرێتەوەو بەردەکەی ئاسمانیش ئەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی بەم چەشنە هەر چوار بەردەکەی سەر زەوی بە دەستێك یەکە یەکە هەل ئەگرێتەوەو لە ناو دەستیدا ئەیان گرێ ، هەر چوار بەردەکە هەل ئەداتەوە سەر زەویو هەر جارەی بەردەکەی دەستی بۆ ئاسمان هەل ئەداو دوو بەرد بە جارێ لە سەر زەویدا هەل ئەگرێتەوەو بەردەکەی ئاسمانیش ئەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی

تا بە٫ دوو جار هەر چوار بەردەکەی سەر زەوی هەڵ ئەگریتەوە هەمیشە هەر چوار بەردەکە هەڵ ئەداتەوە سەر زەوی ، بەردەکەی دەستی بۆ ئاسمان هەل ئەداو سێ بەرد لە زەویدا هەل ئەگریتەوەو بەردەکەی ئاسمانیش ئەگریتەوە ، بەردەکەی تریش بەم جۆرە لە سەر زەویدا هەڵ ئەگریتەوە . لە پاشان هەر چوار بەرد بۆ زەوی هـــەڵ ئەداو هەر چواریان بە جارێ هەڵ ئەگریتەوە . دیسان هەڵیان ئەداتەوەو یەکە یەکە هەڵیان ئەگریتەوە بە چەشنی یەکەم جار وە دەس بە بەشی دووەمی ئەم یاری‌یە ئەکا ،

هەر چوار بەردەکەی دەستی هەڵ ئەداتەوە سەر زەوی‌و تەنیا بەردێك لە دەستیدا ئەمێنێتەوە ، پەنجەی گەورەو دۆشاو مژەی دەستیکی وەکوو کەوان لی ئەکات‌و لە سەر زەویدا ئەیان چەقینێ لە پیش چوار بەردەکە ، کچەکانی تریش بەردێك لە چوار بەردەکە لە پیش دەستە چەقاوەکەی‌دا ئەکەن بە ( مەلا ).

پیویستە کچە یاری کەرەکە هەر جارەی کە بەردەکەی دەستی بۆ ئاسمان هەڵ ئەدا بەردێك لە سێ بەردەکانی سەر زەوی ( جگە لە مەلا ) لە ژیر دوو پەنجە کەوانەکەی‌دا دەری بکا بەبێ ئەوەی بەردەکە بە مـەلا بکەوێ‌و بەردەکەی ئاسمانیش ئەگریتەوە پیش ئەوەی بکەویتە سەر زەوی ، بەم جۆرە هەر سێ بەردەکە لە ژیر دەستیدا دەر ئەکا لە پاشان بەم جۆرە مەلاش دەر ئەکات بە ژیر کەوانەکەدا . لە دووایی‌دا هەر پینج

بەرد لە ناو دەستەکانی ئەگرێو بە خێرای هەڵیان ئەدات بۆ ئاسمان وە بە پشتی هەردوو دەستەکانی کە ( بە یەکەوە پانیان ئەکانەوە ) بەردەکان ئەگریتەوە ، جا چەند بەردی بەم جۆرە گرتەوە هەر یەکێکیان بە ئارەزووی خوی ئەکا بە شتێ کە ئازاری کچەکانی تری پێوە بدا . یەکیان ئەکا بە مار ، یەکێ بە لیفە ، یەکێکی‌تر بە شانە ... هتد .

منداڵەکانی تریش هەر یەکە دەستی خۆی لە سەر زەویدا پان ئەکانەوەو پشتی دەستی ئەکەویتە سەرەوە ، هەر جارەی یەکێکیان بە هەموو بەردەکان ئازار ئەداو هەر جارەی یەکێك لەم بەردانە بۆ ئاسمان هەڵ ئەداو نینۆکی هەر چوار پەنجەی دەستی بە هێز بە پشتی دەستی کچەکەی تردا ئەخشێنێو ئەڵێ ( شانە )و بەردەکە لە ئاسمانەوە ئەگریتەوە پێش ئەوەی بکەویتە سەر زەوی . بەم جۆرە تا جارێ بەردەکە ئەکەویتە سەر زەوی پێش ئەوەی بیگریتەوە ، ئەمجا بەردیکی‌تر هەڵ ئەداو قونجیلکەییکی بە هێز لە پشتی دەستی کچەکە ئەداو ئەڵێ [ مار ] وە بەردەکە لە ئاسماندا ئەگریتەوە بەم جۆرە تا ئەم بەردەش ئەکەویتە سەر زەوی . بەردەکانی تریش بەم جۆرە هەر یەکە بە ناوی خۆی ئازاری کچەکەی پێوە ئەدا تا هەموو بەردەکان کۆتاییان دێ . ئەمجا کچەکانی تریش یەکە یەکە وەکوو کچەکەی پێشوو بە هەموو بەردەکان ئازار ئەدرێن .

بەلام ئەگەر سەرکەوتووەکە کچیکی خۆشەویستی تێ کەوتبێ ، ئەوا هەموو بەردەکان ئەکا بە شتێ بێ ئازار وەکوو ( سابون ) واتە کە بەردەکە بۆ ئاسمان هەڵ ئەدا ناو لەپی خۆی بە نەرمی بە دەستی کچەکەدا ئەخشێنیو ئەڵی ( سابونە )و بەردەکە ئەگریتەوە بەم چەشنە تا جارێ بەردەکە ئەکەوێ ، هەر ووها بەردەکانی تریش ئەکا بە شتێ بێ ئازار .

ئەمجا لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوە . ئەگەر لە بەشی یەکەمو دووەمی ئەم یارییەدا هەر جارێ کچەکە بەردەکەی ئاسمان نەگریتەوە پیش ئەوەی بکەویتە سەر زەوی ، یا بەردیکی لێ جێ بمینێ لە کاتی هەڵگرتندا ، یا لە دەستیدا بکەویتە خوارەوە کچەکە لە یاری ئەکەوێو کچیکی‌تر لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکاتەوە .

# ٤ ـ تیتلی سماق

دوو کچ پشتیان بە یەکەوە ئەکەنو لە تەنیشت یەکا ئەوەستن واتە هەر یەکەیان روویان لە لایەکە ، هەر یەکیکیان دەستیکی ئەخاتە ژیر هەنگڵی کچەکەی‌تر و لە سەر ملی کچەکەدا ئەی سوڕێنیتەوە ، دەستەکەی تریشیان بۆ تەنیشتە بەرملاکەیاندا

دریژ ئەکەن ، لە سەر ئاوازێکی تایبەتی هەڵ ئەپەڕنو بە دەوری یەکدا ئەسوڕێنەوە یەکیان ئەڵی : تیتلی سماق ؟.
ئەوەی‌تر ئەڵی : نانی گەنم .
ئەوەی یەکەم ئەڵی : تیتلی سماق ؟.
ئەوەی‌تر ئەڵی : نانی جۆ .

لە هەر گوژە پانیکدا چەند قوپەنە کچێك بەم جورە دوو دوو بە تُوندی بە سەر یەکدا ئەسوڕێنەوە بەم جورە پرسیارو وەلام دانەوەیەدا کە دەستیان لە سەر ملی یەك داناوە ، دەنگو ئاوازەکانیان تیکەڵ یەك ئەبی وەکوو دەنگی بولبول کە لە دارستانەکاندا ئەخوێنن وە دیمەنیکی زۆر جوان ئەبەخشی بۆ ئەو کەسەی کە سەیریان ئەکا لە کاتی یاری‌دا

## ٥ - چولی چولیانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٢ - ٥ ) کچ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٨ - ١٢ ) سالی دا . لە سەر زەوی حەوت خانە دروست ئەکەن لە تەنیشت یەك کە دریژایی هەر خانەیەك بەژنە منداڵیك بی بە بەژنی خویان ، بەرینایییەکەشی دوو پی بی ، لە دووای خانەی حەوتەمیش چولی‌یە کە چوار گۆشـەیەکی بە دریژایی بەژنیکە .

بەردیکی پان ، یا تاسولقەیێك بە قەدەر ناولەپێك یا بچووکتر ئەکەن بە ساپ . یەکێکیان دەس بە یاری ئەکا ، ساپەکە بە دەست بۆ خانەی یەکەم هەڵ ئەداو بە چوززەکە لە سەر یەك پێ ئەڕواو بەردەکە بە پێیەکەی خانە بە خانە ئەباو ئەیگێڕێتەوە لە خانەی یەکەم دەری ئەکا ، جاری دووەم ساپەکە بۆ خانەی دووەم هەڵ ئەداو وەك جاری پێشوو ئەی باتە چۆڵی‌و ئەیگێڕێتەوە لە خانەی یەکەم دەری ئەکا ، ئەمجا بۆ خانەی سێیەو چوارەو پێنجەو شەشەو حەوتەو چۆڵی بەم جورە هەڵیان ئەداو بە چوززەکە ئەیگەیەنێتە چۆڵی‌و ئەیگێڕێتەوە بە مەرجێ بەردەکە بوهەر خانەیێك هـــەڵ بدات بکەوێتە ناویەوەو ، ئەو پێیەی بەرزی ئەکاتەوە نەیخاتە ســەر زەوی تا ســاپەکە ئەباتە چۆڵی‌و ئەیگێڕێتەوە ، پێیەکەی تریشی نەکەوێتە سەر خەتی خانەکان‌و چولی هەروەها بەردەکەش نەکەویتە ســەر خەتەکان ، خۆشی لە کاتی هەڵدانی ساپەکە بو خانەکان شـەقاوێ لە دووری خانەی یەکە بوەستی ئەگەر یەکێ لەم مەرجانەی تەواو نەبێ لە یاری ئەکەوێ‌و کچەکەی دووای ئەو دەس بە یاری ئەکات لە سەریەوە ئەویش هەر بەم مەرجانە . بەلام ئەگەر یاری کەرەکەی پێشوو هیچ کەم‌و کوڕی نەبێ‌و هەموو مەرجەکانی تەواوبێ ئەوا هەر لە یاری بەردەوامەو لە کاتی هاویشتنی بەردەکە بۆ چولی لە سەر ئاوازێکی تایبەتی ئەڵی :

ئەی چولیکە بەڕیالیکە
مالم دوورەو نزیکیکە

ئەگەر سایەکە کەوتە ناو چولی ئەوا بە چوززەکە ئەچێ و بەردەکە خانە بە خانە ئەگێڕێتەوە تا لە خانەی یەکە دەری ئەکا ئەم کچە چولی تەواو ئەکاو خانەی دووە ئەبێ بە ( ئیسرەحات) بو ئەو وە لە کاتی یاری‌دا هەر جارێ گەیشتە ئەم خانەیە هەر دوو پێیەکانی ئەخاتە سەر زەوی‌و لە ناو ئەم خانەیەدا ( بێن ) ئەدا بە ئارەزووی خۆی . ئەمجا پێیەکەی بەرز ئەکاتەوەو لێی دەرئەچێ . جا چەند جاری چولی تەواو بکا هەندە لە خانە جەوتەکان ئەبی بە ئیسرەحاتی کە [ ٢ ، ٤ ، ٦ ] هەمووی ئەبێ بە ئیسرەحاتی ئەوو سی جاریش زیاتر چولی تەواو بکا ئەوا لە ناو چولی‌دا چەند جیگائێك بو ئیسرەحاتی خوی دیار ئەکا بە قەدەر زیادەکەی . تا جارێ لە یاری ئەکەوێ بەلام ئیسرەحاتەکانی هەر ئەمێنی بو جاریکی‌تر کە ریزەی ئەگاتەوەسەر. ئەمجا کچەکەی دووای ئەو لە سەریەوە دەس بە یاری ئەکا بە مەرجی لە کاتی یاری‌کردنیدا لە سەر هەموو ئیسرەحاتەکانی کچەکەی پیشوو بازبداو پێی نەکەویتە ناویانەوەو هەروەها سایەکەشی ، تا ئەویش چەند جارێ چولی تەواو ئەکاو هەندە ئیسرەحاتەی‌ئەبێ لە خانەی ( ٢ ، ٤ ، ٦ ، چولی ) . هەرووها کچەکانی تریش بەم جورە یەکە یەکە یاری ئەکەن تا لە یاری تیر ئەبن . جا کامیان ئیسرەحاتی لە هەموویان زۆرتربێ ئەو سەر ئەکەوێ .

# ٦ ـ حووحایی

( ٢ ـ ١٠ ) کچ لە تەمەنی ( ٨ ـ ١٢ ) ساڵیدا بەرانبەر یەك لە سەر زەویدا بە چینچکان دائەنیشن کە هەموو گرانایی لەشیان ئەکەویتە سەر هەردوو پێیەکانیانو هەموو لەگەڵ یەکدا بە پەلەو بەبێ وەستان خۆیان بۆ ئاسمان هەڵ ئەدەنو لە سەر چینچکا دائەنیشنەوە ، لەگەڵ خۆ هەڵدانەکەشیاندا ئەسوڕێن وە یەکیکیان لە سەر ئاوازەیەکی تایبەتی ئەم هەلبەستە ئەڵیو ئەوانەی تریش دیڕ بە دیڕ بە دووایەوەدا ئەیگێڕنەوە :

حووحایی

خۆ نەمرم دەت بەزینم
دۆخینت دەبسینم
بو برای خومت دینم

یا ئەڵی :

حووحایی

نانی دایکی خومە
یەك بە بەژنی خۆمە
بەژنی خۆم چنارە
نەختی خوم هەزارە

له سەر بەردە بۆری
کەزیم بوونە گوری
ناکەم پەستەك سۆری
لە سەر بەردە سپی‌مە
تری‌ی تایفی‌مە
بە گولەی قایل نیمە
خوشکی تفەنگ چی‌مە
بە گولەی رازی نیمە
لە سەر بەردە رەشی
کەزیم کەییە لەشی
ناکەم پەستەك رەشی

جا هەر یەکێ ماندووبیو بوەستێ ، یا بکەویتە سەر زەوی لە کاتی یاری‌دا لە یاری‌یەکە دەر ئەچی تا یەکێکیان ئەمینیتەوەو بە سەر هەموویاندا سەر ئەکەوێ‌و ئەیان بەزێنێ .

❁❁❁❁

# ٧ ـ حەمەشکێ

دوو مندال بەرانبەر یەك ئەوەستن‌و بە هوی پەنجەکانیان هەر دوو دەستیان وەکوو چەنگال لە یەك گیر ئەکەن ، لە سەر ئاوازەیێکی تایبەتی ئەم یاری‌یە ئەڵێن :

## حەمەشكی

دۆدانەی سەر بەژشكی
كابانی دەو بە كەشكی

واتە هـــەر جارەی یەكیان ئەوەی‌تر بۆ لای خۆی رائەكیشی‌و ئەڵی : حەمەشكی ، ئەوی تریش خۆی بۆ شل ئەكاو ئەڵیت : دۆدانەی ســـەر بەژشكی . ئەمجا كچەكەی‌تر خۆی راست ئەكاتەوەو بە پیچەوانە كچەكەی یەكەم بۆ خۆی رائەكیشی خۆی بە لای پشتیدا خوار ئەكانەوە ئەڵی : حەمەشكی . كچەكەی یەكەمیش خوی بە سەریدا خوار ئەكاتەوەو ئەڵیت : كابانی دەو بە كەشكی .

بەم جورە بە لای یەكدا خوار ئەبنەوەو هەر جارەی یەكیكیان ئـەوەی‌تر بو خوی رائەكیشی ، هەندە بە توندی بە لای یەكدا خوار ئەبنەوە لەگەڵ ئەم یاری‌یەدا كە پەرچەمەكانیان وەكوو دەرویشا ئەلەریتەوە .

دەدەدەدەدە

## ٨ ـ حیللانی

[ ٣ ـ ١٠ ] كچ لە تەمـەنی [ ٨ ـ ١٢ ] ساڵی‌دا دەستی یەك ئەگرن‌و بازنەیی لە تەنیشت یەكدا ئەوەستن ، هەموو بازنەیي ئەسوڕێن بە توندی‌و بی راوەستان لە سەر ئاوازەی ئەم

هەڵبەستە کە یەکێکیا ئەی‌لی کە هەر دیڕێك ئەڵیت لە هەڵبەستەکە کچەکانی‌تر هەمـــوو بە جارێك ئەڵێن : حیلّلانی . ئەمـەش هەڵبەستەکەیەتی :

| | |
|---|---|
| هە چەرمە چەرمە چەرمە | حیلّلانی |
| حەز لە بووکێ خۆ شەرمە | » |
| بووکم بوو حەللارم بوو | » |
| لە گەڵ ووسوەللارم بوو | » |
| ووسـوەللاری دوو گردی | » |
| دەم هیناوو دەم بردی | » |
| لە برام مارە دەکردی | » |
| مارە مارە هـــەڵبەزی | » |
| بە ســـنجاق‌و بە دەرزی | » |
| ســنجاقی تۆم زیڕینــە | » |
| لە خــالانم گیڕینــە | » |
| خـالانی تۆم خەندەکە | » |
| ماینۆکێ گێ بەڵەکە | » |
| ماینۆکە ماخـۆت مری | » |
| لە دەو کەروان بمری | » |
| کەرووی لە قوم قومۆکی | » |
| دوو چاو لە نیرگزۆکی | » |

| | |
|---|---|
| نیرگـزۆکـە ماهی‌یـــە | حیللانی |
| دوو کڕی لە پشت کەزی‌یە | » |
| ئەو کەزیانە چ لی‌کەی | » |
| ماڵو میردی پی دەکەی | » |
| مـاڵو میردت خرابی | » |
| دەرکۆلـەی پیـوە درابی | » |
| دەرکولەی بە زنجیرە | » |
| تیدایە شـــیخو مـــیرە | » |
| شیخو میرو ئەحمەد بەگ | » |
| جووتە سوارەکی چەلەنگ | » |
| لە بلباســـی بووە دەنگ | » |
| بلباس هاتیە بە قنـــجی | » |
| شـــەڕە لە سەر برنجی | » |
| سمایلاغەی هاوار کرد | » |
| تڤەنگا قوتەی سوار کرد | » |
| بیستو شەشی مردار کرد | » |

تا هەموو کچەکان شل ئەبن ئەمجا دەستی یەك بەر ئەدەنو بین ئەدەن . چل پەنجا ساڵی لە پیش ئیستا کچە عازەبەکانیش تا تەمەنی شانزە ساڵی ئەم یاری‌یەیان ئەکرد ، بەلام ئیستا بووە بە یاریکی تایبەتی کچان .

# ٩ ـ خانی چولکە

لە ڕۆژانی بەهاردا چەند منداڵێك هاوبەشی ئەکەن ، هەر یەکێکیان پێویستیەکی شیوکردن لە گەڵ خۆیدا ئەبا . یەکی خوێ ، یەکی ساوار ، یەکێك پیاز ، یەکی مەنجەڵ ، یەکیتر نان ، ئەوەیتر ئاو ، هەرووها کەرستەی چا لێنان . ئەم کچانە لە ئاوایی دوور ئەبنەوە ، هەر کچێ ، یا دوو کچ لە گەڵ یەکدا خانی چولکەییك بۆ خۆیان دروست ئەکەن ، بەم جۆرە چەند خانی چولکەییك دروست ئەکەن بە بەرد ، یا بە کەستەك دیوارێك بازنەیی دروست ئەکەن بەرزاییەکەی دوو ستێ زیاترە جێگای دەرکەشی بۆ بەتاڵی ئەهێڵنەوە .

کە خانییەکانیان تەواو ئەبێ کچەکان بە سەردان ئەچنە لای یەك ، خانە خوێیەکە زۆر بە خێر هاتنی گەرمی میوانەکەی ئەکاو ڕێزی ئەگرێو لە گەڵ یەکدا دائەنیشن بە گفتو گۆ .

کە نزیکی نیوەڕۆ ئەبێ هەموو کچەکان هەر یەکە ئەو کەرەستەی کە لە گەڵ خۆیدا هێناویەتی ئەیدەن بە گەورەترین کچ لە هاوبەشەکانیان ، کە تەمەنی لە دە ساڵ زیاتر بێ ، ئەویش شیویان بۆ دروست ئەکا (شیو قلۆکە) کە بە زۆری شیوی ساوار بە تۆڵکەیە ، کە شیوەکە پێ گەیشت هەر یەکەیان بەشی خۆی

وەر ئەگرێو دەس ئەکەن بە نان خواردن، بەم جورە چایەکەش لێ ئەنێنو لە دووای شیو خواردندا ئەي خۆنەوە . ئەمجا دەس ئەکەن بە یاریو گورانی . تا ئیوارە بەم خوشیو شادیە رۆژ ئەبەنە سەر ، دەمەو رۆژ ئاوا بەرەو ئاوایی ئەبنەوە بە گورانی وە چەپلە ریزان .

---

## ١٠ ـ دوونگە مەررانی

ئەم یارییە لە بەینی ( ٤ ـ ١٢ ) کچ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٠ ) ساڵیدا . هەموو کچەکان پشتی یەك ئەگرزو بە پیوە بە دووای یەکدا ئەوەستن ، کچەکەی پیشەوە ئەبی بە سەرکار ، ئەوانەی تریش هەموو بە دووایەوە وەستاون .

| سەرکارەکە ئەڵی : | کچەکانی تریش هەموو بە جاریَ ئەڵێن : |
|---|---|
| ١ـ دەچمە داران ؟ | ١ـ دێم دڵێم . |
| ٢ـ دزك لە پیتان زادەچی ؟ | ٢ـ کلاشمان هینایە . |
| ٣ـ گورگ دەتان خوات ؟ | ٣ـ تفەنگی بزنومان پێیە . |
| ٤ـ تینیتان ئەبی ؟ | ٤ـ ئاومان هینایە . |
| ٥ـ ریکامان دوورە ؟ | ٥ـ کەرمان هینایە . |
| ٦ـ دەچمە داران ؟ | ٦ـ دێم دێم . |

بەم جۆرە هەر چەندی سەرکارەکە هەنجەتیان پێ ئەگرێ کە لە گەڵ خۆیدا نەیان با ، بەلام مندالەکان هەموو هەنجەتەکانی ئەبڕن بۆ ئەوەی لە گەڵ خۆیدا بیان با . کە سەرکارەکە زانی هەر ناگەڕێنەوە ناچار ئەڕواو منداڵەکانیش بە دووایەوەن .

یەکی ئەبێ بە گورگ ، لە سەر ریگای ریزە کچەکاندا دائەنیشێ ، کە منداڵەکان تووشی ئەبن هەموو بە سەرکارەکە ئەڵێن ئەوا کۆلکە داریکمان دۆزیەوە ، سەردارەکەش دەست لە لەشی گورگەکە ئەداو ئەڵی : هێشتا تەڕە هەڵناقێ تا لەو سەری ئەگەڕێینەوە ووشك ئەبێتەوە . سەرکارەکە ئەڕواو کچەکانیشی بە دووایەوەیە تا دەورەیەك لە سەر گورگەکەدا ئەسوڕێنەوە ، منداڵەکان دەست بۆ گورگەکە دریژ ئەکەن‌و ئەڵێن : دارەکە ووشك بووە کە سەرکارەکە دەست ئەداتە گورگەکە ، گورگەکە هوشـــی ئەبێتەوەو لە منداڵەکان راست ئەبیتەوەو بە سەرکارەکەیان ئەڵی : رووتم ئەوێ . سەرکارەکەش پێی ئەڵی : بڕۆ لە پشتەوە وەریگرە گورگەکە ئەچێ لاچکە کورتەکی منداڵەکەی دووایی ئەگرێ‌و دەستیکی پیدا ئەخشێنێ، ئەگەڕێتەوە جیگاکەی خۆی‌و ئەڵی : دەخوم دەخوم دوونکەکی تەڕ ، لە جیگای خوی نویژیك ئەکاو ئەگەڕێتەوە لای کچەکان‌و بە سەرکارەکە ئەڵی : دوونکەکە پشیلەخواردی! دوونکیکی ترم ئەوێ ؟ سـەرکارەکەش نایداتێ ، گورگەکە بە سەرکارەکە ئەڵیت : وەللە دەخوم دوونکەکی تەڕ ، سەرکارەکەش

وەلامی ئەداتەوەو ئەلیت : وەللە نادەم دوونکی مەزێ . گورگەکە هیرشیك بو مندالەکان ئەبا ، کچەکانیش لە ترسان هەموو بەجارێ رائەکەنو خۆیان لە گورگەکە دوور ئەخەنەوە بۆ پشـــت ســـەرکارەکەو بە دووایدا ریز ئەبنو دەستیان هەر بە پشتی یەکەوەیە ، گورگەکەش ئەگەر توانی ئەوا مندالەکەی دووایی هـەموویان ئەگرێو ئەیباو لە جیگایەکدا دای ئەنیو ئەگەڕێتەوە لای کچەکانو هیرشیان بو ئەباو مندالەکەی دووایی هەموویان ئەباو لە گەل ئەوەی تردا دای ئەنی ، بەم جورە هەر جاری مندالیك ئەبا . تا هـــەموو مندالەکان یەکە یەکە ئەبا ، تەنیا سەرکارەکە ئەمینیتەوەو لە سەریەوە دەس بە یاریەکە ئەکەنەوە ،

# ١١ ـ سابونە رەقە

دوو مندال لە تەمـەنی ( ٦ ـ ١٢ ) سالیدا بە پیرە ئەوەستنو پشتیان بە یەکەوە ئەنوسینن ، یەکی لە کچەکان هەر دوو دەستی لە سەر هەر دوو شانی کچەکەیتر ئاوا ئەکاو لە ژێر قولیەوە دەری ئـەکا ، کچەکەی تریش هـەر دوو دەستی ئەخاتە ژێر قولی کچەکەو هەر دوو باسکی دەســـتەکانی بە دەستەکانی خوی ئەگرێ .

هەر جارەی یەکیکیان ئەوەی‌تر بەرز ئەکانەوەو سینگی خوی بو پیشەوە خوار ئەکانەوەو ئەلی : ( ســـابونە رەقە ) . ئەوەی تریش ئەلی : بە تەقە تەقە . ئەمجا بە پیچەوانە ئەوەی‌تر ئەمەیان بەرز ئەکاتەوەو ئەلی : کیسەو کەمەر . ئەویش ئەلیت : یا پیغەمبەر .

بەم جورە هەلبەستانە هەر یەکەیان دیریك ئەلین‌و پیدا ئەچنە خوارەوە ، ئەمەش هەلبەستەکەیەتی :

ســـابونە رەقـە
بەتەقـــە تەقـــە
کیسەو کەمـەر
یـا پیغـــەمبـەر
چەقـــەلی جومی
مەســـینەی گومی
ئـاگر کەشـــە
پـلاو خـوشـــە

## ١٢ ـ سوتام برژام

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٦ ـ ١٢ ) کچ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٧ ـ ١٠ ) سالی دا ، دوو کچ ئەبن بە سەردار و نەختێ لە مندالەکانی‌تر دوور ئەبنەوە ، دوو تاسولقە لە پیش خویان

دائەنێن هەر یەکە نەختێ تفیان لە سەر ئەکەن ، یەکێ لە تاسولقەکان ئەکەن بە زێڕ ئەوەی تریش گووە .

منداڵەکانی تریش چوار چمکێ لە سەر زەوی دائەنیشن‌و هەر یەکەیان بە دەستی راستی پەنجەی گەورەی پێی چەپی ئەگرێ ، بە دەستی چەپیشی پەنجەی گەورەی پێی راستی ئەگرێ . دوو منداڵی تریش هەر جارەی یەکێ لە دانیشتوەکان بۆ لای دوو سەردارەکە ئەبەن کە هەر یەکەیان بن هەنگڵیکی بە دەست ئەگرن لەم لاو لەو لای ، ئەگەر هەڵگیراوەکە لە ریگا دەستیکی لە پەنجەی پێی بەربێ دوو کچەکەی هەڵیان گرتووە پێی ئەڵێن دۆخینی باوکت بەزی . بەم جۆرە هەڵی ئەگرنەوە تا ئەیگەیەننە لای دوو سەردارەکەو لە بەرانبەریاندا دای ئەنێن ، کچەهەڵگیراوەکە لە ریگادا هەر ئەڵێ : سوتام برژام بووم بە کەباب . کە دای ئەنێن دوو سەردارەکە لێی ئەپرسن : لەم دوو تاسولقەیە کامیان زێڕەو کامیان گووە ؟ ، کچەکەش دەست بۆ یەکیك لە تاسولقەکان دریژ ئەکاو ئەڵێ : ئەمە زێڕە ، دەس بۆ ئەوەی تریش دریژ ئەکاو ئەڵێ : ئەوەش گووە . ئەگەر چۆنی ووتی وابو ئەوا ئەبێ بە زێڕ ، واش نەبێ ئەبێ بە گوو . بەم جۆرە منداڵەکانی تریش یەکە یەکە ئەهێنن‌و ئەم پرسیارانەیان لێ ئەکەن ئەوەی زێڕبێ ئەچێتە ناو منداڵە زێڕەکان ، ئەوەی گووبێ ئەچێتە ناو منداڵە گووەکان .

گووەکان ئەبن بە پیسکە ، زیڕەکانیش لە دەورەیاندا ئەگەڕێن و گاڵتەیان پێ ئەکەن و پێیان ئەڵێن : ( پیسکە ئەوەم بۆ بشو نینـــکە ) . کە پیسکەیێک بۆ هەر یەکێ ئەچێ زیڕەکە دائەنیشـێ چەنکو هەر پیسکەیەك دەست لە سەری زیڕێکی بە پبوە وەستاو بدا پیسکەکە رزگار ئەبێ و ئەبێ بە زیڕ ، دەست لە سەر دراوەکەش لە جێگای ئەودا ئەکەوێ و ئەبێ بە پیسکە .

# ١٣ ـ موری خولکانی

دوو کچ بەرانبەر یەك لە سەر زەوی دائەنیشن و هەر یەکەیان قۆمەتە خۆلیك لە پیش خویان کۆ ئەکەنەوەو دەنکە موریێکی ئەخەنە ناویەوەو قۆمەتەکە ئەکەن بە دوو بەشی وەکو یەك هەر یەکە لە پیشە خۆیدا ، هەر جارەی یەکیکیان دەستیکی بە سەر هەر دوو قۆمەتەکەی ئەوەی تردا ئەگیڕێ و ئەم هەڵبەستەی لە گەڵدا ئەڵیت :

هو زیوانە زەرگەتتانە
لە پشت بیرێ مزگەفتانە

خودا دەڵی : لەوە نیـیە ئەوەتانە

که هەلبەستەکە دووایی هات دەستی لە سەر کام قومەت بی ئەویان ئەبژیرێو ئەیپشکنیتەوە ، ئەگەر دەنکە موری یەکەی تیدابی ئەوا بو خویەتی ئەگینا کچەکەی تر لە ناو قومەتەکەی تردا بو خوی ئەی دۆزیتەوە .

کچەکەی تریش بەم چەشنە قومەتیکی پیش ئەم کچە بو خوی ئەبژیرێو لە ناویدا ئەگەڕێ ئەگەر تییدابی بو خویەتی ئەگینا کچەکە بو خوی لە قومەتەکەی تردا دەری دینی .

# ١٤ ـ مەگری ، مەگری مەگری

( ٤ ـ ١٥ ) کچ لە تەمەنی ( ٧ ـ ١٢ ) سالیدا دەستی یەك ئەگرن و بازنەیی بە پیوە ئەوەستن ، بە جاری ئەسوڕین و خویان ئەلەرینەوە لە سەر ئاوازەی ئەم گورانی یە کە یەکی لە کچەکان ئەی لی :

مەگری ، مەگری مەگری
پیکررا بچینە قەبری

قەبری تەنگ و تارە
پڕ لە مشك و مارە

مشكو مار حەزيايە
خوی لە ررمي دايە
ررمي هووكە هووكە
برديان جووتە بووكە

بووكي مالي ميری
برديان بو يەخسيری
يەخسيری قەلاتي
ئەحمەد بەگي گاتي
دوو دەسرۆكي داتي

دەسرۆكي هەوری‌يە
لە بريني پيچی‌يە

بريني كاميشي
بەردان دەقەليشي
بەردی ئەو لە مالي
پيدادەن دەسمالي

دەسمالي پيرۆزە
لە ماينەكي بوزە

لە سەر ئاوازی ئەم گورانيە ئەسووررين و كچەكە چەند جاری لە سەريەوە دوو بارەی ئەكاتەوە تا هەموو شل ئەبن .

# ١٥ ـ هەلور بەلور ( زایی مایی )

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٣ ـ ٦ ) کچ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٠ ) سالی‌دا . هەموو لە تەنیشت یەك دائەنیشن‌و پێ‌یەکانیان بو پیشەوە دریژ ئەکەن‌و تا چوکیان رووتی ئەکەن ، یەکیکیش ئەبی بە سەردار لە بەرانبەریان دائەنیشی ، پەنجەی شادە ( دۆشاو مژە )ی دەستی راستی ئەخاتە ناو دەمیەوەو تەرری ئەکاو یەکە یەکە ئەیخاتە سەر لاقی مندالەکان‌و هەر ووشەییك لەم هەلبەستە ئەلی‌و پەنجەکەی لە سەر لاقیکەوە ئەخاتە سەر لاقیکی‌تر بە ریزە ، ئەمەش هەلبەستەکەیەتی :

زایی مایی
دوو زوورنایی
زوورنا چەککە
پی بە لەککە
عەیشی ماوان
لە خوشناوان
دەگری چاوان
چاوێ بە گوو
پیم تیوە چوو
هەلگر ئەتوو

یا ئەڵی : هەلوور بەلوور تەکامە
زەردو سۆرو شەمامە

ئـــاوە بـــەرە
دەنکە زەرە

میخم کوتا میخ هەڵبەزی
تیکەی راستم ئەمەی گەزی

دووا ووشە لە هەڵبەستەکە لە سەر کام لاق کۆتایی بی قونجیلکەیەکی لی ئەدا ، منداڵەکەش ئەو لاقەی ئەکیشیتەوە ژیر لەشی خوی‌و دای ئەپوشی بە کراسی خۆی ، هەر کاتێ جیگاییکی گوشتی ئەم لاقە دیاربی ســەردارەکە قونجیلکەیەکی وای لی ئەدا سووری ئەکاتەوە . ئەمجا لە سەریەوە دەس بە هەڵبەستەکە ئەکاتەوە ، بەم جۆرە یەکە یەکە تا هەموو منداڵەکان لاقەکانیان ئەکیشنەوە بۆ ژیر خۆیان‌و دای ئەپوشن .

ئەمجا بەشی دووەم لەم یاری‌یە دەس پی ئەکا کەهەر جارەی کچیك بانگ ئەکاو ئەم پرسیارو وەلامانەی لە گەڵ ئەلی :

| سەردارەکە ئەڵی : | کچەکەش ئەڵی : |
| --- | --- |
| ١ـ چیت لە بنە ؟ | ١ـ مافورە . |
| ٢ـ چیت لە سەرە ؟ | ٢ـ تەندوورە . |
| ٣ـ چی پیوە دای ؟ | ٣ـ زەنکەزوورە . |
| ٤ـ چیت تیژاچوو ؟ | ٤ـ دەرزیلە . |
| ٥ـ نەختی ئاووم بدێ ؟. | ٥ـ ها ( لەگەڵ دەست دریژ کردنیکدا ) |

سەردارەکەش دەستی بۆ دەمی ئەباو دەمی لیك ئەداو زۆر بە تامەزرۆ ( وەکوو یەکی شتیکی خۆش بخوا ) ، ئەلیت : تاله ، جاریکیتر دەمی لیك ئەداو ئەلی : شیرنە ، جاری دووایی ئەلی : زەقنە بووتە . بە کچەکە ئەلی : هەلسە کەرەکە ئاو بدە ؟ کچەکەش هەردەو دەستی ئەخاتە سەر چوکەکانی خویو بە پەلە هەڵ ئەستیتەوە ، ئەگەر چوکی قرچەی لیوە هات ئەبی بە زیڕ ، ئەگەر هیچ چرقەیەکیشی لیوە نەهات ئەوا ئەبی بە گوو .

کچەکانی تریش بەم چەشنە بانگ ئەکاو ئەم پرسیارو وەلامو فەرمانەیان لە سەر ئەکا ، ئەوەی زیڕبی ئەچیتە جیگاییك دائەنیشی ، گووەکانیش لە لاییکیتر دائەنیشن .

ئەمجا بەشی سییەمی ئەم یارییە دەس پی ئەکەن . زیڕەکان هەر یەکە نەختی لە کراسی خویان بە هەر دوو دەست لە پیشە خوبەوە ئەگرنو بە دەورەی گووەکاندا ئەسووڕینەوە ئەلین : پیسکە هەندەم بو بشو نیسکە ، ئەوانیش هیرش بو زیڕەکان ئەبەن بو ئەوەی دەست لە سەریان بدەن پیش ئەوەی دابنیشن ( هەر وەکو دووایی یاری « سوتام برژام »ی ژمارە [١٢] لە یارییەکانی تایبەتی کچان ) .

# ١٦ ـ هەلیکسو

دوو منداڵ بەرانبەر یەك ئەوەستن و لەسەر ئاوازەییکی تایبەتی ئەم یارییە خۆیان بۆ ئاسمان هەڵ ئەدەن و پێیەکانیان لە لە یەك دوور ئەخەنەوەو دەستەکانیشیان بۆ ئاسمان بەرز ئەکەنەوەو لە سەر سەریان هەر جارەی چەپڵەیەك لێ ئەدەن و دەستەکانیان بۆ خوارەوە شـــۆڕ ئەکەنەوەو شەپێك لە رانەکانیان ئەدەن و پێیەکانیان جـووت ئەکەنەوە . هەر یەکەیان لە سەر ئاوازەی هەڵپەڕینەکە جنێو بە کچەکەی بەرانبەری ئەدا بەم هەڵبەستانە ، هـەر کچێك بە ناوی کچەکەی بەرانبەری . کە یەکیان ناوی ئایش بێ ئەوەی تر ئەڵێ :

هەلیکـۆ ئەمن و ئایش
هەلیکسو دەرپێ قایش

ئەگەر ئەمەش ناوی زارا بێ ئەوا ئایش بەم هەڵبەستە وەڵامی ئەداتەوە :

هەلیکسو ئەمن و زارە
هەلیکـو لە سەر دارە
هەلیکـو وەرە خوارە
هەلیکسو بێ بن و بارە

جا کامیان ماندوو بێ و لە یارییەکە رابوەستێ تێ ئەکەوێ .

# ١٧ ـ هەی مشك ، مشك مشك ؟

( ٣ ـ ١٢ ) کچ دەستی یەك ئەگرن و بە پیوە ماژنەیی ئەوەستن بەرانبەر یەك ، یەکێ لە کچەکان ئەم هەلبەستە لە سەر ئاوازەیەکی تایبەتی ئەم یارییە ئەلی ، کچەکانیش هەموو لەسەر ئاوازی گورانیەکە ئەسوڕێن و لە دووای هەر دیڕێك کە گورانی بێژەکە ئەی‌لیت لەم هەلبەستە هەموو بە جارێ ئەلێن : هێ هێ ئەمەش هەلبەستەکەیە :

هەی مشك ، مشك مشك ؟
مشـــك هـــاتە کولینێ
دەســـتی کرد بە فنە فنێ
خواردی ماســـتی هەمینی
هاجـــەر عەمرت نەمینی
دەچمە کەربێ گورانی
دەکوژم نێری و بەرانی
ســـەرو پێچك لو کابانی
ریخـەلوك لو شـــوانی
جـــەرگ و ناو لو میوانی

# ٣ ـ یاری یەکانی هاوبەشی کورو کچ

## ١ ـ بابی بابی

ئەم یاری یە لە بەینی ( ٢ ـ ١٠ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٤ ـ ٧ ) ساڵی دا . گەورەیەك ئەبێ بە سەرداریان ، منداڵەکان هەموو لە بەرانبەریدا دائەنیشن ، گەورەکە ئەم شتانە لە دەستی خۆیدا ئەکرێ کە هەر یەکە ناوێکی تایبەتی یان هەیە لەم یاری یەدا :

١ـ پارچە پەڕۆکیك ( قاوە ) .
٢ـ نەختێ پەمۆ ( پەندیرە ) .
٣ـ بەردە مردەیەك ( گۆزە ) .
٤ـ کەلە پووشێکی بچووك ( داسوکە )
٥ـ قلە قشپلیك ( گاێ رەش ) .

هەر جارەی یەکێ لەم شتانە لە ناو دەستی خۆیدا ئەگرێو بۆ پێش منداڵەکان یەکە یەکە لێیان ئەپرسێ : قاوە ، پەندیرە ، گۆزە ، داسوکە ، گاێ رەش ؟

منداڵەکەش ناوی یەکێك لەم شتانە ئەڵێ ؛ ئەگەر ئەو شتە لە دەست گەورەکەبێ ئەوا منداڵەکە سەر ئەکەوێ‌و لە یاری‌یەکە دەر ئەچێ ، گەورەکەش دەستی خۆی ئەکێشێتەوەو شتێکی‌تر ئەخاتە ناو دەستیەوەو بۆ منداڵێکی‌تری درێژ ئەکاو ناوی هەموو شتەکان بۆ ئەو منداڵیش ئەژمێری ، منداڵەکەش ناوی یەکی لەم شتانە ئەڵێ . ئەگەر ئەو شتە لە ناو دەستی گەورەکەبێ ئەویش لە یاری دەرئەچێ‌و سەر ئەکەوێ ، هەویش نەبێ ئەوا دەستەکەی بۆ پێش منداڵێکی‌تر درێژ ئەکا ، ئەگەر ئەویش نەیزانی یەکی‌تر .

بەم جۆرە تا هەموو منداڵەکان یەکە یەکە دەر ئەچن ، تەنیا یەکێکیان ئەمێنێتەوە لە دووای هەموویاندا کە هیچ جارێ ناوی شتەکەی ناو دەستی گەورەکە نازانی لەو کاتەی کە لە پێشیدا رای‌ئەگرت . ئەو منداڵە تی ئەکەوێ .

سەر دارەکە سەری تی‌کەوتوەکە ئەخاتە سەر رانی‌و لە ژێرەوە بە دەستەکانی هەر دوو چاوی ئەگرێ‌و ئەڵێ : تەپە رەپە ، تەپە رەپە .. هتد .

منداڵەکانی تریش هەموو رائەکەن‌و هەر یەکە خۆی لە جێگایەکدا ئەشارێتەوە . ئەمجا سەردارەکە چاوی تی‌کەوتووەکە ئەکاتەوەو دای ئەنیشێنی ، کە سەیری هەر چوار دەورەی خۆی ئەکا هیچ منداڵێك نابینی ، سەردارکە ناوی یەکی لە منداڵەکان

ئەڵی کە ئەڵیت : ( فیسار ) لە کام لا بێتەوە ، منداڵەکەش دەستی بۆ لایێك درێژ ئەکاو ئەڵی : لەم لایە ، گەورەکە بانگی منداڵەکە ئەکاو ئەڵی : فیسار [ ناوی منداڵەکە ] زەڕ ، منداڵەکەش لەو جێگایەی کە خۆی شاردووەتەوە دەر ئەپەڕێ‌و ئەڵی : عۆۆو ئەگەر لەو جێگایە دەرچوو کە تیٖ‌کەوتووەکە پەنجەی بۆ درێژ کردبوو ئەوا گەورەکە پیٖی ئەڵی : وەی ماکەر ، بەڵام لە لایەکی‌تر بێتەوە ئەوا سەردارەکە پێی ئەڵی : وەی نێرەکەر . هەموو منداڵەکان یەکە یەکە بەم جۆرە کو ئەکەنەوە ، ئەوەی ماکەربیٖ تیٖ ئەکەوێ ، نێرەکەرەکانیش سەر ئەکەون .

لە پیٖشا منداڵە چاوگیراوەکەی پیٖشوو لە سەر چینچکان دائەنیشیٖ‌و سەری ئەخاتە سەر کۆشی سەرەدارەکە ، یەکیٖ لە نێرەکەرەکان سواری پشتی ئەبیٖ ، سەردارەکە هەر جارەی چەند پەنجەیەکی دەستیکی ئەخاتە سەر پشتی ملی داچەقاوەکەو ئەڵی :

بابی بابی
حەمەدەی رابی
تەقڵەی لە چەندان دابی

منداڵەکەش ژمارەیەك ئەڵی کە لە ژمارەی پەنجەکانی دەستیٖك زیاتر نەبیٖ ، ئەگەر ئەم ژمارەی کە ئەی‌ڵی لە گەڵ ژمارەی ئەم پەنجانە یەك بیٖ کە لە سەر پشتی ملیەتی ئەوا منداڵەکەی سەر پشتی دیٖتە خوارەوەو نێرەکەریکی‌تر سواری پشتی ئەبیٖ . بەم

جۆرە یەکە یەکە نێرەکەرەکان سواری پشتی ئەبن و کە ژمارەی پەنجەکانی لە پشتی ملیدا زانی دێتە خوارەوە . ئەویش بەم جۆرە یەکە یەکە سواری پشتی هەموو ماکەرەکان ئەبی .

## ٢ ـ بچین بچین

ئەم یارییە لە بەینی ( ٢ ـ ٥ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٤ ـ ٧ ) ساڵیدا ، هەموو بازنەیی بەرانبەر یەك دائەنیشن ، یەکیکیان هەردوو دەستەکانی لە پیش خۆیەوە ئەگرێ، بە دەستیکی پەنجەکانی دەستەکەی تری یەکە یەکە ئەچەمینیتەوە لە پەنجەی بچرووکەوە دەس پی ئەکاو ئەڵی : بچین بچین ؟ ، کیوە بچین ؟! بچینە دزی !: ، خوداو پیغەمبەر قەبوڵ ناکا ؟، بە ملی من !.

ئەم یارییە چیرۆکو بە سەر هاتی ئەم پەنجانە ئەگیڕێتەوە پەنجەی بچووك بە پەنجەکانیتر ئەڵی : بچین بچین ؟ تاکو بیر لە کاریك بکەنەوە بیکەن ، پەنجەی دووەم ( برای تووتە ) سەری سڕ ئەمینی و ئەڵی : کیوە بچین ؟! ، پەنجەی نێوان ( هەڵمەقۆ ) ئەڵی : بچینە دزی !! ، پەنجەی شادە ( دۆشاو مژە ) بەرگری ئەکاو ئەڵی : خوداو پیغەمبەر قەبوڵ ناکا ؟. چەنکو دزی شتیکی ناپاکە گوناهبار ئەبین ، پەنجەی گەورە ئەڵی : بە ملی من !! وانە گوناهی هەموو پەنجەکان ئەخاتە ئەستۆی خۆی و رشتیان ئەکا لە سەر دزی کردن . بەم جۆرە منداڵەکان یەکە یەکە پەنجەکان ئەژمیرن و لاسایان ئەکەنەوە بە ریزە .

# ٣ ـ بووکه بەبارانە

دوو مانگ لە پایز بچێ دەخڵو دان پێویستی بە باران هەیە ، کە بکاتە سەری زستانو مانگێ لە زستان بچێو پەڵە نەکەوێ خەڵکەکە بۆ باران تەنگاو ئەبن ، پاش باران پەڵەش تا جۆزەردان حەفتە حەفتە دەخڵو دانە چاندراوەکان پێویستیان بە باران هەر هەیە ، ئەگەر جارێ ماوەی دە پانزە رۆژ باران نەبارێ ئەوا هەمیشە تەنگاوی ئەکەوێتە ناو خەڵکداو چاوەڕێی باران ئەکەن .

جا کە باران یا باران پەڵە لە کاتی خۆی تێپەڕبێ ، منداڵیش هەست بە پەستیو دڵ تەنگی خەڵکەکە ئەکەن لە بەر بێ بارانی ، بووکۆکەیەکی گەورە دروست ئەکەنو دوو منداڵ هەر یەکە لە لایەکەوە بن پێلی ئەگرنو منداڵەکانی تریش بە دووایانەوە ئەڕۆن ، بە ماڵەکانی گوندی ، یا گەڕەکەکاندا ئەسوڕێنەوەو لە بەر دەرگای هەر ماڵێ ئەوەستن ئەڵێن :

هەیارانە بووك بارانە
گەنم رزی لە چالانە
گەنمی حەسەنو حوسەینیانە
هەموو قڕبوون لە تینانە

وه ئەڵێن :

هـــەیاران و مەیـاران
یا خـــوا بنێری باران
لـۆ فەقیرو هـــەژاران
ئەم ســـاڵ بیاری باران

کابانی ماڵەکەش کۆتکە ئاوێ ، یا جامە ئاوێ ئەپرژێنی بە سەر بووکۆکەکەو دەرزیەکی لی ئەدا ، لەگەڵ دەستی خۆشیدا چەنگە گەنمی ، یا چەنگە جۆیەك ئەدا بە منداڵەکان .

منداڵەکان ئەو گەنمو جۆیەی کە کۆی ئەکەنەوە گشتی بە قەسپ ، یا میوژ ، یا هەر جۆرە خواردنیکیتر ئەدەنو لە گەڵ یەکدا بە خۆشی ئەیخۆن .

# ٤ ـ پررنا پوش ؟

( ٢ ـ ٧ ) منداڵ بەرانبەر یەك دائەنیشن ، یەکیکیان شتیك لەم شتانەی کە یاری لە سەر ئەکەن لە دەستی خۆیدا ئەگرێو هەردوو دەستەکانی ئەخاتە کۆشی بەبێ ئەوەی منداڵەکان هەست بکەن دەستەکەی شتیکی تیدا هەیە یا نیە بۆ پیش یەکێ لە منداڵەکانی دریژ ئەکا بە قوچاوەیی وە ئەڵێ : پڕنا پوش ؟.

منداڵەکەش بە ئارەزووی خۆی ئەڵیت : پڕ ، یا ئەڵی : پوش ، ئەگەر دەستەکە شتی تیدا هەبێ ئەوا پڕە ، هیچیشی تیدا نەبێ پوشە ، کە دەستی خۆی ئەکاتەوە ، ئەگەر چۆنی منداڵەکەی‌تر ووتی‌وابوو ئەوا ئەوەی دەستی بۆی دریژ کردووە شتیك ئەدات بە دەس بۆ دریژ کردوەکـــە ، ئەگەر بە پیچەوانەش‌بێ ئەوا ئەوەی دای گرتووە شتیك لەوەی‌تر وەر ئەگرێ . بەم جۆرە یەکە یەکە دەستی بۆ هەموو منداڵەکان دریژ ئەکا هەر جارەی بۆ پیش یەکێکیان جا سەرکەوێ یا ژیرکەوێ . ئەجا منداڵەکەی دەستی راستی ریزەی دیتە سەر واتە ئەویش هەر وەکوو ئەوەی پیشوو دەســـــتی خۆی بۆ هەموویان یەکە یەکە رائەگرێ ئەجا ئەوەی دەستە راستی ریزەی ئەگاتی . .

## ٥ ـ تاقمانە جووت ؟

ئەم یاری‌یەش وەکوو ( پڕنا پوش ) ئەکرێ ، بەلام هـەر منداڵیك کە شتەکە لە ناو دەستیدا ئەگرێ پێویستە ئەو دەستەی بۆ پیش هەر منداڵیك دریژ ئەکا شتیك یا چەند شتیکی تیدابێ کە یاری لە سـەر ئەکەن ، ئەجـا بە منداڵەکە ئەڵیت : تاقمانە جووت ؟. منداڵەکەش کە دەستی بۆ دریژ کراوە ئەڵی : تاق ، یا ئەڵی : جووت بە هەردووکیان شتەکانی ناو دەستەکە

ئەژمیرن ، ئەگەر چۆنی دەس بۆ دریژ کراوەکە وونی وابو ئەوا ئەو شتانەی ناو دەستەکە هەمووی بۆ خویەتی ، بەلام ئەگەر بە پیچەوانەبی ئەوا مندالەکە چەندی لەم شتە لە ناو دەستی خویدا گرتبی هەندە لەم شتە لە مندالەکەیتر وەر ئەگری کە دەستی بوی دریژ کردبوو . جا چ تاق بی ، یا جووت .

# ٦ ـ تەررو هیشکانی

لە یارییکی وا کە دوو منداڵ بیکەن ، یا دوو بەش بن سەرۆکەکانیان تەڕو هیشکانی ئەکەن بۆ ئەوەی کامیان لە پیشا دەس بە یاری بکا ، یا کە دوو منداڵ لە سەر شتی ناکوکیان ئەبی تەڕو هیشکانی ئەکەن بو ئەوەی بزانن قسەی کامیانە .

## تەررو هیشکانی دوو جورە

أ ـ یەك لە مندالەکان پارچە بەردیکی پان ، یا تاسولقەیەك بە دەستیەوە ئەگریو روویکی بە تف تەڕ ئەکاو بە مندالەکەیتر ئەلی : تەڕت ئەوی یا هیشك ( ووشك ) ؟. مندالەکەش ئەلی: تەڕ ، یا ئەلی هیشك ( ووشك ) . ئەمجا پارچەکەی ناو دەستی بو ئاسمان هەڵ ئەدا ، کە کەوتە سەر زەوی ئەگەر ئەو رووەی بکەویتە سەرەوە کە مندالەکە داوای کردووە ئەوا داواکەرەکە سەر ئەکەوی لەگینا تی ئەکەوی .

ب- یەکی لەم دوو منداڵە هەر دوو دەستەکانی بە دەمیەوە ئەگرێ بەبێ ئەوەی منداڵەکەیتر بزانێ ناولەپی دەستێکی بە زمان تەڕ ئەکاو پشتی دەستەکانی ئەخاتە لای منداڵەکەی ترو بۆ پێشیدا دریژیان ئەکاو پێی ئەڵی : کام دەستت ئەوێ ؟ وانە کامیان تەڕە . منداڵ[illegible] لە گەڵ ئاوازی ئەم هەڵبەستە هەر جارەی پەنجەی بۆ یەکی لە دەستەکان دریژ ئەکاو ئەڵی :

هـــۆ زیوانە زەگەتانە

لە پشت بیرێ مزگەوتانە

( خودا دەڵی ) : لەوە نیەبـــە ئەوەتانە

واتە کە پەنجەی بۆ دەســـتێك دریژ ئەکا ئەڵیت : ( هۆ زیوانە ) ، بۆ دەستەکەیتر ئەبا ئەڵیت : ( زەگەتانە ) بۆ دەستەکەی پیشووی دریژ ئەکاتەوەو ئەڵی : ( لە پشت بیرێ ) بۆ دەستیتر ئەڵی : ( مزگەوتانە ) ئەمجا ئەڵی : ( خودا دەڵی لەوە نیەبە ) ، دەستەکەیتر ئەگرێو ئەڵیت : ( ئەوەتانە ) . جا ئەو دەستەی کە گرتوویەتی تەڕ بێ ئەوا سەر ئەکەوێ ، ئەگەر ووشك بێو دەستەکەیتر تەڕبێ ، ئەوا منداڵەکەی کە دەستی خۆی تەڕ کردووە سەر ئەکەوێ .

# ٧ ـ حندر حوپ

ئەم یاری‌یە لە بەیـــنی ( ٢ ـ ٦ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٥ ـ ٨ ) ساڵی‌دا ، ناوەراستی کاریتەیەك یا شەقڵەیەك ئەخەنە سەر داریکی ئەستوور ، منداڵەکان ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، هەر بەشـەی لە سەریکی دارەکەدا دائەنیشـن ، بەشیکیان بە پێ خۆیان بەرز ئەکەنەوە ، بەشەکەی تریش خۆیان گران ئەکەن تا سەری دارەکە ئەگانە سەر زەوی ئنجا ئەوانەی‌تر خۆیان گران ئەکەن‌و ئەوانەش خۆیان بەرز ئەکەنەوە واتە هەر جارەی بەشیکیان بەرز ئەبنەوەو بەشەکەی‌تر نزم ئەبنەوە .

ئەو بەشـــەی بەرز ئەبیتەوە ئەڵین : حندر حوپ ، بەشەکەی‌تر کە بەرز ئەبنەوە ئەڵین : بارت چی‌یە ؟. بەشەکەی یەکەمیش کە دووبارە بەرز ئەبنەوە ئەڵین : نیـسك‌و نۆك . واتە هەر بەشیکیان کە بەرز ئەبنەوە لە ریگا ئەم قسانە ئەکەن‌و بە پەلە هەر جارەی بەشیکیان بەرز ئەبنەوەو ئەم پرسیارو وەڵامە لە گەل یەکدا ئەکەن‌و چەند جارێ دووبارەی ئەکەنەوە تا لە یاری تیر ئەبن .

# ٨ ـ حەکایەتی میشە

ئەم یاری‌یە لە بەینی دوو منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٠ ) ساڵی‌دا . یەکێکیان بەوەی‌تر ئەڵێت : حەکایەتی میشەت بۆ بگێڕمەوە ؟ منداڵەکەی تریش ئەلێ : باشە بۆمی بگێڕەوە ، منداڵەکە ئەلێ : بۆچ ئەلیی باشە بومی بۆمی بگێڕەوە ؟! منداڵەکەی‌تر ئەلێ : ئەی بڵێم چی ؟!. منداڵەکە پێی ئەڵێت : بۆچ ئەلیی ئەی بڵێم چی ؟. ئەوەی‌تر ئەڵێ : ئەمە چی‌یە ؟!. منداڵەکە پێی ئەڵێ : بۆچ ئەڵییت ئەمە چی‌یە ؟.

جا ئەگەر منداڵەکەی دووەم شارەزای ئەم یاری‌یە بێ ئەڵێت : خودا گەورەیە ، منداڵەکەی یەکەم قسەی ئەبڕێ‌و ناتوانێ بەرکری بکات . ئەگینا هەرچی منداڵەکەی دووەم لە دەمیدا دەرچی ، منداڵەکەی یەکەم ئەڵێ : بوچ ئەڵییت ... وتەکەی منداڵی دووەم دووبارە ئەکاتەوە . تا منداڵەکەی دووەم کە چاوەڕوانی حەکایەتەکەیە بێزار ئەبێ‌و خوا خوایەتی کە منداڵەکەی یەکەم وازی لێ بێنێ‌و لاسای نەکاتەوە ، تا ئەگەر پێ‌بکەنێ ، یا هەر جێگاییکی بجووڵێتەوە ، منداڵەکەی یەکەم پێی ئەڵێ : بۆچ پێ‌ئەکەنی ، یا بوچ ئەم جێگایەت ئەجولێتەوە

# ٩ ـ دەچیە بەر مەرری ؟

دوو منداڵ لە تەمەنی ( ٥ ـ ٧ ) ساڵیدا ، بۆ ئەوەی بزانن کامیان ترسنۆکە ، یەکیکیان بە ئەوەی‌تر ئەڵی : دەچیە بەر مەڕی ؟ ئەوەی‌تر ئەڵیت : ئـا ئەچم . یەکەمیـان ئەڵی : نان بۆ شوانی ئەبەی ؟ دووەم ئەڵیت : ئـا ئەبەم یەکەمیان ئەڵی : لە گورگی ناترسیی ؟ ئەوەی‌تر ئەڵی : نەء ناترسیم .

کە ئەم پرسیارانەی هەموو لی کرد لە پڕ منداڵەکەی یەکەم دوو پەنجەی شادەو نیوانی دەستیکی بو هەردوو چاوی منداڵەکەی‌تر دریژ ئەکاو ئەڵی : ووشت . ئەگەر چاوی نوقاند بە ترســـنۆك دەرئەچی ، بەڵام ئەگەر چـاوی هەر زەق بی‌و نەی‌قوچینی ، ئەوا بە ئازاو دلیر دەرئەچی .

ئەوەی تریش ئەم کارە بەمـــەیان ئەکا . ئەمجا بۆیان دەرئەکەوی کامیان ترسنۆکە . جا هەر کامیان ئازاتربی گاڵتە بە ترسنۆکەکە ئەکا .

ـــــــــ

# ١٠ ـ سویندە گورگانە

گـەورەکان ئەم یاری‌یە لە گەڵ بچووکەکاندا ئەکەن ، گەورەکە دەستەسڕێ ، یا ئەنگوچکی کراسی ، یا هەر شتیکی پەڕوییی خاوین ئەخاتە ســـەر ناولەپی دەستیکی‌و خواردنیکی

خۆشی ئەخاتە ناویەوە ، لە قۆرتابی بەینی سێ پەنجەی (گەورەو نیوانو دوشاو مژە ) ، بە منداڵەکە ئەڵی : ئایا ئەتوانی ئـەم خواردنە لە ناو دەستمدا بە زمان هەڵبگریەوە بیخۆی ؟ منداڵەکەش لە خوشـیان زمانی بۆ خواردنەکە دریژ ئەکا بو ئەوەی بیخوا ، گەورەکە لە پڕ بە هەرسـی پەنجەکانی ناوبراو زمـانی منداڵەکە بەتوندی ئەگرێو هاوار هاوار بە منداڵەکە ئەخا ، پاش ئەوەی هـەموو منداڵو گەورەکانی‌تر زۆر پێی پێ ئەکەنو گاڵتەی پێ ئەکەن ، ئەمجا گەورەکە زمانی منداڵەکە بەر ئەداو رزگار ئەبی وە ئەبی بە پەند بۆ هەموو منداڵەکان بو ئەوەی تا بیر لە شـتی نەکەنەوە خویان بو هەموو شتێ راپیش نەکەن ، وە بە دووای نەوس نەکەون بو هـەر شـتیك بچی تا بە تەواوی لە ئەنجامی نەگەنو بیری لی نەکەنەوە .

## ١١ ـ فرری فرری قەل فرری

ئەم یارییە لە بەینی ( ٥ ـ ١٢ ) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی ( ٥ ـ ١٠ ) ساڵیدا . یەکی ئەبی بە سەردار ، ئەوانەی تریش هەموو لە بەرانبەریدا دائەنیشن ، سەردارەکە هەر جارەی کە ناوی باڵندەیەك ئەڵی هەموویان دەستیان بەرز ئەکەنەوە بو ئاسمان ، لە ناوەراستی ئەم ناوانە سەردارەکە جار جـار ناوی شتێکی‌تر ئەڵی کە باڵندە نەبی ، هەر منداڵی دەستی بەرز بکانەوە

لە گەڵ ناوەکەدا هەموو گاڵتەی پی ئەکەن و لە یاری یەکە دەرئەچی سەردارەکە ناوی شتەکە لە دووای ناوی مەلیکی وا ئەلی کە زۆر ناویان لە یەك بچی ، بو وینە ئەلیت : فڕی فڕی کەو فڕی ، فڕی فڕی کەر فڕی ، فڕی فڕی کوتر فڕی ، فڕی فڕی کوتك فڕی . جا هەر یەکی لە ناوی کەر ، یا کوتك ، یاهەر ناویکیتر کە باڵندە نەبی ، دەستی بەرز بکاتەوە ، منداڵەکانیتر گاڵتەی پی ئەکەن و لە یاری یەکەش دەرئەچی ، تا تەنیا یەکی لە منداڵەکان ئەمینیتەوە و هیچ هەلەیەك ناکات ، وە بە سەر هەموویاندا سەر ئەکەوی کە یەکە یەکە لە یاری یەکەدا دەر ئەچن .

# ١٢ ـ قجیلك ، بابەجیلك

( ٢ ـ ٦ ) منداڵ لە تەمەنی ( ٤ ـ ٧ ) ساڵیدا .

هەموو بازنەیی بەرانبەر یەك دائەنیشن و روویان لە یەك ئەکەن یەکیکیان هەردوو دەستەکانی لە پیش خویەوە ئەگری ، بە دەستیکی پەنجەکانی دەستەکەی تری یەکە یەکە ئەچەمینیتەوە و ناوەکەی ئەلی ، لە پەنجەی بچووکەوە دەس پی ئەکاو ئەلی : قجیلك ، بابەجیلك ، دۆلە دریژ ، شادە نیژ ، ئەسپی کوژ . واتە کە پەنجەی بچووك ئەقوچینیتەوە ئەلی : قجیلك ، لە ( برای توونە ) ئەلی : بابەجیك ، لە پەنجەی نیوان ئەلی : دۆلە دریژ

له چوارەمدا ( دوشاو مژە ) ئەلی : شـادە نیژ ، لە [ قامکی گەورە ] شدا ئەلی : ئەســـپی کوژ . جـا کە بو منداڵەکانی دەرخست کە ناوی هەموو پەنجەکان ئەزانی ، منداڵیکیتر دەس بە ژماردنی پەنجەکانی خوی ئەکا . بەم جورە هەموویان یەکە یەکە بە ریزە هـەر جـارەی یەکیکیان ناوی هەموو پەنجەکانی خوی ئەلی ، هەر یەکیکیش نەیزانی هەموو گاڵتەی پی ئەکەن .

# ١٣ ـ کەرەکم بارکردی‌یە ؟

کە منـداڵیك حوشـترالوکی . یا شـــیرە کلویەك ، یا زەردەوالەیەك [ زەنکە زوورە ] ئەگریٔ چوززە ژەهراویەکەی زەردەوالەکە بە دەست هەڵ ئەکیشیو ئەچیتە ناو قوپەنە منداڵیك ئەو شتەی کە گرتوویەتی بە دزی ئەیخاتە سەر لەشی یەکیکو ئەلیت :

کەرەکم بـار کردی‌یە
ئاگـای لە خوی نی‌یە

منداڵەکانیش هەر یەکە دەستی بە سەر شـــانو سەری خویدا ئەگیرێ بو ئەوەی بزانن کامیان بارکراون ، بارکراوەکە دەستی بە شـــتەکە نەکەویٔ ئەیگریٔ کە فرەی بدا ، کە چاوی بە زەردەوالەکە ( یا ئەو شـــتەی کە لی‌ی بارکراوە ) ئەکەویٔ

هاوار ئەکاو دەستەکەی رائەوەشینی ، جاری وا ئەبی هەر چەندی هەوڵ ئەداو دەستی رائەوەشینی شتەکە لە دەستی نابیتەوەو لە گەڵ گریان و هاوار توق ئەکا ، یا لە گەل دەست راوەشاندنەکەیدا شتەکە ئەکەویتە سەر لەشی یەکیکیتر ، ئەویش خوی رائەوەشینی و هاوار ئەکا .

بەم جورە تا خاوەنەکەی شتەکە ئەگریتەوە بە دەست وەگەلی بە ترسنوکەکە پی ئەکەنن و گالتەی پی ئەکەن ، مندالەکەش شتەکە ئەباو لە جیگاییکیتر مندالیکی تری پی بار ئەکا .

# ١٤ ـ گشت و سەیران

لە بەهارا کە کوردستان بە دەشت و گردو زورگ و چیاو کەندو دۆلەکانیەوە ئەڕازیتەوە بە هەموو جورە رەنگی لە گیاو گول و نیرگزو لاولاوەو دەخڵ و دان ، کە سروشتی وولاتەکەمان پیمانی ئەبەخشی . لە بەر ئەوە دانیشتوان لە شارو لا دێیەکاندا دەر ئەچن بو ناو ئەو سروشتە دل فرینە بە تایبەتی مندالەکان کە هیچ کاریان نیە ، لە بەیانیەوە دەستە دەستە ، پول پول ریك ئەکەون بو گشت و سەیران ئەم دەشتە ئەگرنە بەر ، هەر کاتی بە شتیکەوە خەریك ئەبن ، جا هەر ناوچەیەك بە جوری سروشتی خوی .

رۆژێ ئەچنە ناو دەخلان بو کوکردنەوەی شەوبوو گولیلکە خاتونەو قوزادەو قنجیلەو توزوکەو ترشوکەو غەردالەو کەنگرو حاپەلکو سیوەلوکو ریواسو سەرکلاوەو پاقلە مارانەو کەرکولەو شەکەرۆك . چاویشیان ئەگیررا بە لاچکی دەخلەکاندا بە دووای ( قازی بازاڕ ° ) دا ، جا هەر مندالی زۆری قازی بازار بگرتایە شانازی پیانەوە ئەکرد ، یا ئەگەڕان بە دووای پەپــولە .

•

رۆژێکیش ئەچوونە ناو ئەو گیاو گولە بەهـــاری‌یانە بو کوکردنەوەی نیرگز ، حاجیلە ، کنیر ، دندووکە حاجی لەقلەق گولیلکە ( گاگرۆ ، نیسان ، مەشکانە ) ، تولکە ، پیفوك شلمیشاق .

رۆژێکی‌تر بو ناو چەمو دەم رووبارەکان بو توتررك [ توی شامی ] و قەلوغانەو کوزەلەو پەلپینەو بەری ئەم دارانەی کە بەهاران پی ئەگا .

منداله بچووکەکانیش کە توانایان نەبوو زۆر لە ئاوایی دوور بنەوە ، لە گوزەپانەکانی جیگای جۆخینان خەریك ئەبوون بە کۆکردنەوەی قەرقۆزەو حـاجیلەو کوارکو دندوکە حـاجی لەق لەق .

° قازی بازار : گیان لە بەریکی بچووکە بە قەبارە وەکوو قالوچەیە بەلام رەنگیکی سەوزو جوانی هەیە .

# ١٥ ـ مال مالانی

ئەم یاری‌یە شـیوەویەکی مەتەلیی هەیە ، بە زۆری لە شەوانی زستاندا ئەکرێ کە چەند منداڵیك کۆئەبنەوە ، یەکیکیان وەسفی ماڵیك ئەکا لە ماڵەکانی گوندەکە ، یا گەڕەکەکە ، ئەو ماڵە خیزانەکەی لە چەند کەس پیك هاتیە ، چەندی کوڕەو چەندی کچە ، چەندی ژنەو چەندی پیاوە .

بۆ وێنە : کە وەسفی خیزانی بکا پێك هاتبێ لە دایكو باوكو سێ خوشكو دوو براو داپیرو باپیریان ئەڵی : ماڵێکم هەیە بە نۆ کەسان . دوو ژن ، دوو پیاو ، سێ کچ ، دوو کوڕ ، دەمیشم لە سەر ماڵی ( فیسار * ) ە .

منداڵەکانی تریش هەموو بیر لە دراوسێکانی ئەو خاوەن ماڵە ئەکەنەوە کە منداڵەکە ناوی هیناوەو رەی لەسـەر ماڵی ئەواندا چـەقاندوە ، ئایا کام دراوسێیان خیزانەکەیان پیك هاتووە لەم ژمارەیەی کە منداڵەکە وەسفی کردووە ؟. هەندە ژنەو هەندە پیاوە ، هەندە کوڕەو هەندە کچەبێ .

جا هـەر منداڵیك کە گومانی لە هەر ماڵێك هەبێ ئەیڵێت . تا یەکیکیان ماڵە وەسف کراوەکە ئەلیتەوەو خۆی وەسفی ماڵێکی‌تر ئەکاو بەم جۆرە هەر یەکی ماڵەکە بدۆزیتەوە ئەویان ماڵێکی‌تر ئەگرێو منداڵەکان بیری لی ئەکەنەوە .

* ناوی خاوەن ماڵیك ئەلی دراوسی‌ی ئەم ماڵە بێ کە وەسفی کردووە .

# ١٦ ـ مەیل مەیلانی

ئەم یاری‌یەش وەکوو یاری‌یەکەی پیشوو شـــبوەیەکی مەتەلیی هەیەو بە زۆری لە شەوانی زستاندا ئەکرێ ، کە چەند منداڵێك لە ماڵیکدا کۆ ئەبنەوە ، یەکیکیان وەسفی باڵندەیەك ئەکا کە لە دلی خویدا گرتوویەتی ، بۆ وێنە : کە وەسفی حاجی لەق لەق ئەکا ئەلی : مەیلەکم هەیە هەندەیە ( هەر دوو دەستی لە یەك دوور ئەخاتەوە بە قەدەر قەبارەی حاجی لەق لەق ) ، دوو باڵی گەورەیە ، دەنوکیکی دریژی هـــەیە ، دوو قاچی دریژیشی هەیە ، رەنگی سپی‌و رەشە ، خواردنی ئاوو کرم‌و مارە ، هیلانەی لە جیگای بەرز دروست ئەکا ، لە زستاندا لە وولاتی ئیمەدا ناژی ... هتد .

منداڵەکان گشتیان لە گەڵ وەسفەکەدا بیر لە باڵندەکە ئەکەنەوە ، زۆر جار پیش ئەوەی وەسفەکە تەواو بکا منداڵەکانی‌تر وەلامی ئەدەنەوە . بەلام ئەگەر منداڵەکان مەیلەکەیان نـەزانی ئەوا بە فیتە ناوی مەیلەکەیان بۆ ئەلی چەند جارێ ، ئەگەر هەر نەیان زانی ئەوا ناوەکەیان بۆ ئەلیتەوەو هەر خـــۆی مەیلیکی تریان بو ئەلیتەوە ، تا جارێ یەکیکیان ناوی مـــەیلە تازەکە ئەزانی ، ئەمجـــا ئەوەی هەلی هیناوەتەوە مەیلیکی‌تر ئەگرێ‌و ئەوانەی تریش هەلی دیننەوە .

# ١٧ ـ مەرری زمزمی

ئەم یـاری‌یە لە بەینی ( ٨ ـ ٢٠ ) منداڵ ئەکرێ ، لە تەمەنی ( ٦ ـ ١٠ ) سـاڵی‌دا ، هەموو بە ریزە لە تەنیشت یەکا رائەوەسـتن‌و دەستی یەك ئەگرن ، یەکیکیان ئەبێ بە مەلا ئەڵی : قازو قورینگ گوریسی ماڵی میری دریژ کەنەوە ؟ منداڵەکان هەر یەکە بە دریژایی باڵیك لە یەك دوور ئەبنەوە بە‌بێ ئەوەی دەستی یەك بەربدەن ، مەلا ئەڵی : تاژیان جل‌کەن ؟ ئەوانیش هەموو بە جارێ لەشیان ئەلەرینەوەو ئەڵێن : جڵ‌ڵ‌ل . مەلا ئەڵی : ماینان جل‌کەن ؟ ئەوایش خۆیان ئەلەرینەوەو ئەڵین : جل‌ل‌ل مـەلایەکەیان ئەڵی : مەلا ئەڵیت نویژیکی پشتـاو پشت بکەن ؟ منداڵەکان هەموو لە سەر گازی پشت دریژ ئەبن بەبێ ئەوەی دەسـتی یەك بەربدەن . بەم جۆرە هەرچی مەلا بیەوێ بەمنداڵەکانی ئەکا ، کە لەم پرسـیارو وەڵامانە ئەبنەوە منداڵەکەی دووایی بە مەلا ئەڵیت کە لە پیشەوە وەستاوە : بە دۆل بێین یا بە زوڕنا ؟ ئەگەر مـەلا ووتی : بە زوڕنا ئـەوا منداڵەکان دەستی یەکیان گرتووەو بە دووای منداڵەکەی پیشەوە ئەکەون‌و لەو سـەرەوە بۆ لای مـەلا ئەچن‌و ئەڵین : تیو ریو ریو ... تا گشتیان لە ژیر دەستی دوو منداڵەکەی پیشـەوە دەرئەچن ( کە بە یەکەوەیان گرتووەو بەرزیان کردونەتەوە ) تەنیا منداڵەکەی دەست سەردارەکە نەبێ دەرناچێ‌و پشتی ئەکەویتە مەلاو رووی ئەکەویتە منداڵەکەی‌تر کە دەستی‌تری

گرتبو . منداڵەکانی تریش چۆن هاتبوون بەم چەشنە بە تەنیشتەکەی تردا ئەگەڕێنەوە جێگای خۆیان . ئەمجا مــەلا ئەڵێ : مەڕی ( فیسار ° ) زا کاورژێکی نێری هینا ( ئەگەر کوڕ بێ ) یا کاوڕێکی مێی هینا ( ئەگەر کچ بێ ) .

ئەوەی دووایی دیسان بە مەلا ئەڵێ : بە دۆڵ بێین یا بە زوڕنا ؟ ئەگەر مــــەلا ووتی بە زوڕنا ئەوا وەکوو جاری پێشوو بۆیان ئەچن ، ئەگەر ووتیشی بە دۆڵ ئەوا وەکوو جاری پێشوو بۆیان ئەچن بەڵام لە کاتی رۆیشتنا هەتا ئەڕۆن هەر ئەڵێن تەپ ، تەپ ، تەپ ... وەکوو دۆڵ کوتان تا هەموویان لە ژێر دەستە بەرزکراوەکانی دوو منداڵەکەی پێش مەلا دەرئەچن تەنیا یەکێك ئەگەڕێتەوەو پشـــتی ئەکەوێتە کاوژەکەو سەرکارەکەی پێشوو ، دیسان مەلا ئەڵێ : مەڕی فیسار زا کاوڕێکی ... هینا جا کچ بێ یا کوڕ . بەم جۆرە یەکە یەکە مەڕی باوکیان ئەزێ و هەموو منداڵەکان پشتیان ئەکەوێتە یەك و وەك شەمەنەفەر بە دووای یەکدا ریز ئەبن و پشتی یەك ئەگرن .

ئەمجا مەلاو منداڵەکەی دووایی هەر یەکەیان لە سەریکەوە منداڵەکان بۆ خۆی رائەکێشێ تا ریزەکە ئەپسێتەوە ، جا کامیان زۆرتر منداڵی بە دووای خۆیدا راکیشابێ ئەو سەرئەکەوێ .

° ناوی باوکی ئەو منداڵە ئەڵێ کە پشتی کەوتووەتە مەلا .

# ١ ـ ئەزە لەزە ( ئەشکە لەشکە )

چەند کەسێ لە جێگاییکیوا کە بیانەوێ لە خۆیان زیاتر هیچ کەسێ تێنەگا ، یا یەکیکی نەشارەزای ئەم جۆرە قسە کردنە بێتە لایان گاڵتەی پێئەکەن بەبێ ئەوەی لە قسەکانیان بگات .

قسە کردنەکەشیان ئەمەیە : کە هەر پیتیك ئەلین لە کانی قسە کردنا ئەم ووشەی بۆ زیاد ئەکەن ( ـەشکە ، یا ـەزە ) بۆ ئەوەی لە خویان زیاتر کەسیکیتر تێنەگا . بۆ وێنە : کە بڵین سیروان ، ئەلین : سەشکە ، یەشکە ، رەشکە ، وەشکە ، ئاەشکە نەشکە . یا ئەلین : ـەزە ، یەزە رەزە ، وەزە ، ئاەزە نەزە . ئەوانەی کە زۆر لە گەڵ یەکدا بەم جۆرە دووابن زۆر بە ئاسانیو بیگرێ وەلامی یەك ئەدەنەوەو وەکوو بولبول پیدا ئەچن بەبێ ئەوەی هیچ کەسیکیتر تیبگا .

ﻪﻪﻪﻪﻪ

# ٢ ـ بارە خییانی

ئەم یارییە لە بەینی سێ کەس ئەکرێ ، یەکیکیان لە سەر چنگ دائەنیشێو هەر دوو چوکی ئەخاتە سەر زەوی ، دووەکەی تریش هەر یەکەیان هەر دوو پێیەکانی ئەخاتە سەر

پشتی داچەماوەکەو لە سەر قوون دائەنیشی ، هەر یەکەیان لە تەنیشتیەکیەوە . وە هەر یەکەیان هەر دوو پێی بەرانبەرەکەی خوی بە دەست ئەگرێ لە سەر پشتی داچەماوەکەوە .

داچەماوەکە هەوڵ ئەدا کە هەر دوو کەسەکەی سەر پشتی هەلبگرێو لە زەوی بەرزیان بکاتەوە ، جا ئەگەر هەلیان بگرێ ئەوا بە هێزە . دووەکەی تریش بەم چەشنە هەر جارەی یەکێکیان دائەچەقینەوە دوو مندالەکەی تر بەرز ئەکانەوە ، جاری وا ئەبی یەکێکیان دوەکەی تر بەرز ئەکاتەوەو لە ئاسمانەوە هەلیان ئەدانە سەر زەوی ، یا دووەکەی سەر پشتی یەکێکیان پێیەکانی ئەوەی تری لە دەست بەرئەبیو هەر دووکیان هەر یەکە بە لایەکدا وەر ئەگەررێنو ئازاریکی باش ئەخۆن .

# ٣ ـ بەللوریو وەیاروك

کچە عازەبەکان کە ئەچوونە سەر زەویو دەشتو زورگ کیلکەکان بۆ چوغانان ، یا کەنگرو تولکەو کاردیو قەلوغانە ... هتد لە ریگادا کە بە نزیك شوانی یا کاروانی ، یا راوچی ، یا جوتیاریکدا تیئەپەررین بە هەلبەستی بەللوریو وەیارۆك جنیویان پێیان ئەدا ، یا کچەکان نەختی لە یەك دوور ئەبوونەوەو خو بە خویی جنیویان بو یەکتر رەوان ئەکرد ، ئەم

هەلبەســـتانەیان بە دەنگ‌و ئاوازەیەکی زۆر خۆش ئەووت بە دەنگیکی بەرز کە لە ناو گوندیەوە گویان بوی شل ئەکردو لە دەنگەکان کچەکانیان ئەناسیەوە .

لە بەللوری کچەکە پەنجـــەی گەورەی زوو زوو لە گەردەنی خـوی ئەدا لە سەر ئاوازەی گورانیەکە وەکوو لیدانی پیانو . بەلام لە وەیارۆك پەنجەی شادە ( دوشـــاو مژە ) لە گەردەنی ئەچەقینی‌و لە ســەرەوە بو خوارەوە پیدا ئەســـوێ‌و هەلینا گرێ‌و زوو زوو لی‌ی ئەدا

زۆربەی هەلبەستەکانی بەللورێ‌و وەیارۆك بۆ نووسین ناشین لە بەر جنیوە بیزەوەرەکانیان ، تەنیا ئەم چەند دیڕە نەبی کە لە چاو ئەوانەی‌تر بە حەوت ئاو شورراینەوە .

«١» بەللـــوری ، بەللـــوری
مەرری عەولا شوانی هەلکانە تەلانی
دەخـــوا دار شـــیلانی

خـــوزی دار شـــیلان بام لە زیێ کیژولان بام
لە ریزی دوگمان بـام لە سەر مەمکولان بام

٭ ٭ ٭

«٢» بەللـــوری ، بەللـــوری
بەللوریٚی بادبنی کیژ چوو ئاویٚ بینی
کورر چوو لیی بســـتینی

٭ ٭ ٭

«٣» بەللـــوری ، بەللـــوری
وەرە خـــواریٚ لە گردی
دەرپیبەکەت ئاو بردی

٭ ٭ ٭

یەکەمیان دەمە تەقێیە لە بەینی شـــوانیك و کچیك ، دووەمیان دەمە تەقێیە لە بەینی کچەکانی سۆرانی و بادینی کە لە سەر ( زیٚی بادینان ٭ ) ئەوەستان بەرانبەر یەکدا ، بەلاّم بە داخەوە وەلاّمی کچە بادینیەکانم چنگ نەکەوت کە بە کچە سۆرانیەکانی ئەلّین . سێیەمیش کچیك بە کچیکی تریان ئەلّی .

لە وەیاروکیشدا هەر ئەم هەلبەستانە بە کاردین تەنیا لە جیـگای بەللوریٚ ئەلّین : هۆ هۆ وەیارۆك ئەجا هەلّبەستەکە ئەلین ، وە هەر ووشەیەکی بەللۆریٚ لە ناو هەلّبەستەکەدا هەبێ ئەیکەن بە وەیارۆك .

---

٭ زیٚی بادینان : لە سەر کەلەك یاسین ئاغاوە ئەبیتە سنووری شیوەی سورانی و بادینی.

# ٤ ـ تەررکی بن بەرری

لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەو شەوانی دریژی زستاندا لە حوجرەی فەقێیانو دیوەخانەکاندا ئەکرا ، کە چەند گەنجێك کۆ ئەبوونەوە یەکێکیان ئەخستە ژیر بەڕە ، یا لبادیك ، گشت لەشیان دائەپۆشیو هەر یەکەیان لنگە کلاشێکیان بە دەستیانەوە ئەگرتو هـەر جارەی یەکێکیان کلاشەکەی بە هێز لە لەشی داپۆشراوەکە ئەدا ، ئەویش ناوی یەکێ لە دانیشتوەکانی ئەووت ئەگەر ناوی ئەو کەســە بوایە کە لێی داوە ئەوا ئەوەی ژیر بەڕەکە رزگار ئەبوو ئەوەی لێی داوە تێ ئەکەوتو ئەچێتــە جێگای لێدراوەکە . ئەگـەر ناوی ئەویش نەبێ ئەوا یەکێکیتر لنگە کلاشێکی لێ ئەدات ، بەم جۆرە هەر جارەی یەکێك لێی ئەداو ئەویش ناویك ئەڵێ ، تا جارێ لە کاتی لێدانا ناوی ئەو کەسە ئەڵێت کە لێی ئەدا ، ئەمجا رزگار ئەبێو ئەوەی لێیداوە جێگای ئەگرێتەوە ... ئەویش هەرووها .

بەلام ئەوەی کە جاری یەکەم خۆی بەخت بکاو بچێتە ژیر بەڕەکە ، پاش رزگار بوونی لە ژیر بەڕەکەدا لە هەر یەکێ بداو ناویشـــی بڵێن ئەیبورن . لە بەر ئەوەی کە جاری یەکەم سەر بە خۆ خۆی بەخت کردووەو چوێتە ژیر بەڕەکەوە .

# ٥ ـ تەلەو ریویانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی دوو کەس ئەکرێ ، یەکیکیان ئەبی بە تەڵە ، هەر دوو دەستەکانی بە یەکەوە ئەبەستن ، هەر دوو پی‌یەکانیشـــی بە یەکەوە ئەبەستن‌و لە سەر دەست‌و پی‌یەکانی ئەوەستــــێ . مندالەکەی تریش ئەبی بە ریوی‌و لنگیکی ئەخاتە مەیانی هەر دوو دەستی تەلەکەو لنگەکەی تریشی ئەخاتە بەینی هەر دوو پی‌یەکانی تەڵە ، سەریشی ئەخاتە ژیر سکی تەلەکەو .

ئەوانەی کە بۆ سەیرکردنیان وەستاون پالی بە تەلەکەوە ئەنین‌و ئەی‌خەنە سەر زەوی ، ریویەکە بە تەلەوە ئەبی . تەلە بە هیزی خوی دەســــت‌و پی‌یەکانی لە یەك دوور ئەخاتەوە ، ریویش دەس ئەکا بە هاوار هاوار لە بەر ئازاری قاچەکانی کە هەر یەکە بە لاییکدا ئەکشین . بەلام ئەگەر ریوی لە تەلەکە بە تین‌تربی سەری ئەخاتە سەر سکی تەلەو پالەپەستووی لە سەر ئەکاو هیزی لی ئەبڕی ، تەلە ناچار خۆی بۆ ریویەکە شل ئەکاو ریویەکە بەبی ئازار رزگار ئەبی ، بەلکو هیشتا تەلە لە بەر ئازاری سکی هاوار ئەکا . بەلام هەر یەکی شارەزای ئەم یاری‌یەبی نابی بە ریوی چونکو زۆر ئازار ئەخوا ئەگەر هیزی تەلەو ریویەکە وەکوو یەك بی .

# ٦ ـ تەندوورە سور کە

( ٨ ـ ١٤ ) گەنج ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، هەر بەشەی سەرداریکیان هەیە ، هەر دوو سەردارەکە ( هۆپ هۆپ قەرەتۆپ ) ئەکەن ، کامیان تێبکەوێ هاوبەشـــەکانی ( دائەچەقینەوە ° ) و سەردارەکەشیان بە دەورەیاندا ئەسووڕێو پاریزگاریـان ئـــەکا . بەشـــەکەی تریش . هەموو بە دەورەیاندا ئەسوڕێن ، هەر یەکێکیان ئەوی هەلکەوێ خۆی بۆ سەر تەندوورەکە هەڵ ئەدا بەبی ئەوەی سەردارەکە بتوانی لەقەی لی بدا ، چەنکو سەرداری داچەقاوەکان لەقە لە هەر یەکێکیان بدا ئەوا بە پیچەوانە بەشەکەی‌تر تێ‌ئەکەون‌و ئەم بەشە داچەقاوەی پیشووش لە دەورەیاندا ئەسوڕێن‌و خۆیان بۆ سەر سەریان هەڵئەدەن بەلام ئەگەر یەکە یەکە خۆیان هەڵدایە سەر تەندوورەکە بە بێ ئەوەی سەردارەکە بتوانی لەقە لە هیچیکیان بدا ئەوا سەردارەکە لە دیاریاندا ئەوەستێ چەنکو هەر یەکێ کە خۆی هەڵدایە سەر تەندوورەکەو پی‌یەکانی لە زەویدا بەرز بووەوە سەردارەکە ناتوانی لەقەیـان لی بدا ، تەنیا لەوانەی سـەر زەوی نەبی‌و بە مەرجێ دەستیشی لە هاوبەشەکانی خۆی بەرنەدا لە کاتی لەقە هاویشتندا .

---

° هەموو بازنەیی لە تەنیشت یەکدا ئەوەستن‌و روویان لە یەك ئەکەن‌و سەریان بو ژوورەوە خوار ئەکەنەوە .

که هەموو خویان هەڵدایە سەر تەندوورەکە  داچەماوەکان ملیان شل ئەبی لە بەر گرانیو سەنگی ئەوانەی کە سـوارى سەریان بوینە ، ناچار تەندوورەکە کور ئەکەنەوە ، یا ئەژوخینو ئەکەونە خوارەوە . ئەمجا لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوەو هەر داچـەقاوەکانی پیشوو دائەچەمینەوە ، بەشەکەی تریش بە دەورەیاندا ئەسوڕینو خویان بو سەر سەریان هەڵ ئەدەن ، تـا جاریٚ سەرداری داچەقاوەکان لەقە لە یەکی ئەدا لە بەشەکەیتر لەو کاتەی پیٚ لە سـەر زەویدایە ، بەبی ئەوەی دەس لە داچەقاوەکانی هاوبەشی بەربدات . ئەمجا هاوبەشەکانی رزگار ئەبنو بەشەکەیتر تیئەکەونو ئەوانەش خویان بو سەر سەریان هەڵ ئەدەن لە کاتی هەڵکەوتا ، سەرداری داچەماوەکانیش پاریزگاری هاوبەشەکانی ئەکا .

# ٧ ـ جغزی

( ٦ ـ ١٢ ) گەنج ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، بەشیك تیئەکەونو ئەچنە ناو جغزیك ( دیڕیکی بازنەییبە کە لە سەر زەویدا ئەکیشریٚ ) ، بەشـەکەی تریش لە دەورەی جغزەکە ئەسوڕینو بە توپیکی پەڕوییی رەق لە بەشەکەی ناو جـغزەکە ئەدەنو لە جغزەکە دوور ئەبنەوە ، ئەوانەی ناو جغزەکەش توپەکە ئەگرنـەوەو بە پەلە بو ئەوانەی دەرەوەی

ئەهاوێن بە مەرجێك لە ناو جغزەکە دەر نەچن ، ئەگەر توپەکەیان لە هەر یەکێ‌دا ئەوا ئـــەوەی لیی‌داوە لە ناو جغزەکە رزگار ئەبی‌و لیدراوەکە لە جیگای ئەودا ئەچیتە ناو جغزەکە . ئەگەر لە هیچ کەسیکیشیان نەدا ئەوا ئەوانەی دەرەوە توپەکە ئەگرنەوەو یەکیکیان ئەهاوی بو یەکیکی‌تر تا یەکیکیان بوی هەل ئەکەوی‌و توپەکە بە توندي لە یەکیکی ناو جغزەکە ئەدا ئەگەر لە هیچ کەسیکیشی نەدا تی‌ئەکەوی‌و ئەچیتە ناو جغزەکە ، هەر یەکیکیش لەوانەي ناوەوە لە یەکیکی دەرەوە بدا رزگار ئەبی‌و لە جغزەکە دیتە دەری لی دراوەکەش تي‌ئەکەوی‌و ئەچیتە ناو جغزەکە .

## ٨ ـ خەجە ررو ( خواجە ررو )

( ٨ ـ ١٦ ) گەنج ئەبن بە دوو بەشي وەکوو یەك ، هەر بەشی سەرداریکیان هەیە ، ئەم دوو سەردارە ( هێپ هوپ قەرەتوپ ) ئەکەن . کامیان تی‌بکەوی هاوبەشەکانی بازنەیي لە تەنیشت یەك دائەنیشـــن‌و پشتیان لە یەك ئەکەن ، هەر دوو ســەردارەکەش لە نزیکیانەوە ئەوەسـتن ، سـەرکەوتوەکە چاوی تی‌کەوتووەکە ئەگری بە هەر دوو دەستي ، هاوبەشەکانی هەموو لەگەل یەکدا رائەکەن‌و خویان ئەشارنەوە تا سەردارەکەیان ئەلی :

قەرە ، قەرە ، قەرە یەك
قەرە ، قەرە ، قەرە دوو
قەرە ، قەرە ، قەرە سێ
خۆتان بکەنە داوو دەرزی

سەردارەکە تا بتوانی ئەم ووشانە یەکە یەکە درێژ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی هاوبەشەکانی بە تەواوی دوور بنەوەو خۆیان بشارەنەوە کە هەموو قسەکانی تەواو کرد چاوی سەردارەکەی‌تر بەرئەدا . ئەمجا هەر دوو سەردارەکە بە دووای ئەواندا ئەگەڕێن کە خۆیان شاردووەتەوە سەرداری تێکەوتووەکان روو لە هەر لایێ ئەکا ئەڵی تاوە ( واتە لەم لایە خۆیان شاردووەتەوە ) ، سەردارەکەی تریش ئەڵی : تاو نیە ( واتە لەم لایە نینە ) . بەم چەشنە بۆ هەر لایێ ئەچن یەکەمیان ئەڵی تاوە ؟، ئەوەی تریش ئەڵی : تاو نیە ، ١ـ تاوە ؟ ٢ـ تاو نیە ... ١ـ تاوە ؟ ٢ـ تاو نیە ؟ ١ـ تاوە ؟ ٢ـ تاو نیە ...

ئەگەر ئەو بەشەیان دیتەوە ( دۆزیەوە ) کە خۆیان شاردووەتەوە ئەوا بە پێچەوانە ئەوان دائەنیشن‌و بەشەکەی‌تر خۆیان ئەشارنەوەو لە سەرێەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە . بەلام ئەگە نەدۆزرانەوە ئەوا لە پڕ هێرش ئەبەنە سەر دانیشتووەکان‌و ئەڵین : ( پێدادە ، پێدادە ... ) ، بە هەر دوو دەستەکانیان چەپەلۆك لە سەرو گیلاکی دانیشتووەکان ئەدەن ،

دانیشتووەکانیش دەس بە هاوار هاوار ئەکەن‌و ئەڵێن : هەی‌داد هەی‌داد هەی‌داد ئەمجا ئەڵێن : خەجە ژوو پینەو پەژۆ ، خەجە ژۆ پینەو پەژۆ ، خەجە ژۆ پینەو پەژۆ ، ...

سەردارەکەیان کە گوێی لە هاوار هاواری هاوبەشەکانی ئەبێ بە راکردن ئەگەڕریتەوە بۆ لایان ، لە دەورەیان ئەسوڕرێ‌و پاریزگاری‌یان ئەکا . ئـــەگەر لەقەی لە یەکیکی بەشەکەی تردا بەبێ ئەوەی دەس لە هاو بەشەکانی خوی بەربدا ئەوا بە پیچەوانە بەشەکەی‌تر دائەنیشن‌و ئەوانەش خویان ئەشارنەوەو لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە .

بەلام ئەگەر سەردارەکە نەیتوانی لەقە لە هیچیکیان بدا بەشەکەی‌تر هەر بە دەورەیاندا ئەسوڕرین‌و هەر یەکیکیان بۆی هەڵکەوێ لە پڕ چەپەڵۆکی لە سەرو گولاکی یەکی لە دانیشتووەکان ئەداو بە پەلە دوور ئەبیتەوە پیش ئەوەی سەرداری دانیشتووەکان بیگاتێ‌و لەقەی لی بدا .

بەم چەشنە لە سەرو گۆلاکی دانیشتووەکان ئەدەن تاکو جارێ سەرداری دانیشتووەکان لەقە لە یەکی لە بەشەکەی‌تر ئەداو لی دراوەکەو هاوبەشەکانی تی‌ئەکەون‌و دائەنیشـــن ، ئەوانەی تریش خۆیان ئەشارنەوەو لە ســـەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە .

# ٩ ـ دار کیشکانی

که دوو گەنج ئەبی بەرکابەرییان ، هەر یەکەیان خوی لەوەیتر بە هـــیزتر بزانی ، گوپالی ، یا داریکی وەك گوپاڵ ئەســتوور دینن ، هەر دوو گەنجەکە لە بەرانبەر یەکدا دائەنیشن‌و پی‌یەکانیان بو پیش خویان دریژ ئەکەنو لە گەڵ پی‌ی یەکدا ئەیکەنە رکە ، هـــەر یەکەیان بە هەر دوو دەستەکانی ناوەراستی دارەکە ئەگرێ کە لە ناوەراستی خویاندا گرتوویانە ، هەر یەکە لە گەنجەکان دارەکە بە هەموو هیزی خوی بو لای خویدا رائەکیشی . جا کامیان ئەوەیتری بو خوی راکیشا ئەویان سەر ئەکەوی‌و بە هیزترە .

# ١٠ ـ دروینەی بەکرەیی

هەمووما‌ن ئەزانین کە دروینە چ ماندوو بون‌و ئازاریکی بو سەپان‌و کرێ‌پاڵەکان هەیە ، بەلام بی‌چاری بوو ئەبوایە هەر بیکەن . لە بەر ئەوە ریگاییکی وایـان دۆزیبووەوە کە بەرگری ئەم ئازارو ماندووبونەی پیوە بکەن وە بیکەن بە سەیرانی کە ئەویش بەکرەیی بوو ، وانە بە گورانی ووتن دروینەیان ئەکرد . زۆربەی سەپانەکان دروینەی بەکرەیی‌یان ئەکردو باشترین شایەر

له ناویاندا هەڵبەستەکانی بەکرەی لە سەر ئاوازەیەکی تایبەتی دروێنە بە گۆرانی ئەووت ، ئەوانەی تریش دێڕ بە دێڕ بە دووایەوەدا هەموو بە جارێ ئەیان گێڕایەوە ، دروینەکەیان وا گەرم ئەکرد کە هەستیان بە ماندوو بوونەکە نە ئەکرد ، کێشە کەرەکەش لە دوایاندا رشستتر ئەبوو لە سەر کۆکردنەوەی سوالەکان . ئەگەر بێو هەڵبەستەکانی بەکرەیی هەموو بنووسریتەوە ئەم پەڕاوە بەشی ناکا . ئەمەش چەند وینەیەك لە هەڵبەستەکانی بەکرەیین :

## ـــ[ تاخمەی کیژان ئەوا هات ]ـــ

تاخمەی کیژان ئەوا هات      یاری من لە گەڵ نییە
لەو لا زولفی کەورۆنەی      زولەیخای خدرییە
مەمکی دوو سێوی لا سوور      بە جووتە هەڵیان داوە
ئەوا سەری دوو ساڵە      بۆ تۆ پاوان کراوە
وەك پاوانی ئاغاکەت      کەس دەستی لی نەداوە
دەچمە شاری هەولیرێ      بە قەیسەری و دوکانە
ئەگەر باوژم پێ ناکەی      چاو کاڵی زۆر تیدانە
سەردارمان محمدە      خۆشەویستی خودایە
سەری لە عەرشی فەلەك      بنی لە ئەرزیدایە
لە گوارەکەی سێ گوێن      بەهەییەی حەسەنییە
گۆتم بە دایکی بڵیم      دایکی لە ماڵی نییە

بـابی وا له هـــەولێره | کاکی وا له جــۆتی‌یه
دەســـتم هاویشته ملی | دایکی به سەر هـاتی‌یه
کولکـــەکی له زگی بێ | ئەســتووری بچێته رانی
کرمـی کەوێته گیانی | وەك سەی بێ کوندەلانی
خواردنی دزك‌و دار بێ | لــــه باتی ئاوو نـانی

ﻊﻊﻊ

تاخمەی کیژان ئەوا هات | یـاری مـن له گەڵدایه
ئەگەر باوڕم پێ نـاکەی | تۆزێ کورتـــه بـالایه
ئەویش به عەیب نـاشی | چونکه نەخشەی خودایه
قـــۆندەرەکی له پێدا | دەگری پەنجەو پاش پانی
چاوی وەســتای کۆرەبێ | له گەڵ دەرزی‌و دورمانی
شلکۆکەی ناوقەد بـاریك | له نواران پـالی داوه
دلم نەهـات چـی بڵێمی | دەمـــم له دەمی نـاوه

## ـــ[ ئەزە ]ـــ

دەك نەمێنیم ها ئەزە سینگت بیستان‌و رەزە
به دلی خۆم لی کرد حەزە

حەزم کردبو له چـــاوی | له سـی بەنـدەی کلاوی
نـاویرم بینـــم نـاوی | له بەر تەرەســـه باوی

# ١١ ـ دزینی هەش

کە یەکێکی شارســــتان چەند رۆژێ لە گوندێکدا بمێنێتەوەو دانیشتوانی دێیەکە بێزاری لێ بکەن لە بەر ئیسك گرانی ، ئەم یارییەی پێ ئەکەن .

چەند گەنجێك دۆستایەتی لە گەڵ ئەکەن بە جۆرێکیوا کە باوەڕیان پێ بکا ، ئەمجا پێی ئەڵێن : جولەکـەیەك لە گوندەکەمان هەیە یەك فەردە هەشمان لێی دزیوە کە زۆر لە زبر بە نرخ ترە ، وا لە ناو کاولێك شاردوومانەتەوە ، تو هەر ئێستا هەشەکە ببە بو شار تا جولەکەکە هەستی پی نەکردووە کە لێی دزراوە ، بیفرۆشەو بەشی ئێمەش لە پارەکە بێنەوە ئەم دێیە ، هەمووماں وەکوو یەك تێدا هاوبەش ئەبین .

بە هەر جورێ بێ تەماح ئەدەنە کابراو رازی ئەکەنو ئەیبەنە ئەو جێگایەی کە هەشەکەیان لێ شاردوتەوە ، ئەو فەردەی کە لە پێشتردا چەند پارچە خشتێکیان خستوەتە ناویەوەو زاریان توند گرێ داوە ئەیدەن بە کابراو ئەڵێن : فەرموو ببە ، بەلام کەس هەست نەکا کە تو بردووتە چەنکو ئێستا پولیسێك هاتوتە دیوەخان نەوەك بگیرێین .

کە کابرا هەشەکە ئەباو نەختێ لێیان دوور ئەبێتەوە ، ئەوانیش بە پەنا دزە دوورو نزیك هەر بە دووایەوە ئەڕۆن ،

که نەختێ لە گوندەکە دوور ئەبنەوە یەکێکیان لاسای جولەکە ئەکاتەوەو دەس ئەکا بە جنێوو بە دووای شارستانەکەدا رائەکاو ئەڵێ : ( ئەی هاواز هەشەکەمیان بڕد ، کوڕە بسوژمان بمگەنێ مازم کاوز بوو ) ، بەم شەوە چەند کەسێکی تریش کە ئاگادارن لەم کارەساتە کۆ ئەبنەوەو بە دووای شارستانەکەدا رائەکەن ، ئەویش کە گوێی لە دەنگی جولەکەو ئەم کۆمەڵە خەڵکە ئەبێ تا تینی تیدا هەیە رائەکا ، جوولەکە ئەڵێ : ( کوڕە پۆزیس بە قوزبانت بم ) . یەکێکیتر لاسای پولیس ئەکاتەوەو ئەڵێ : کوڕە ئەم سەگ باوکەم بو بگرن تا بیدەم بە قانون .

شارستانەکە کە هەست ئەکا ئیش هەندە گەورەەبوو فەردەکە بە هەتەوە فڕە ئەداو تا توانای هەیە رائەکاو لەگوندەکە دوور ئەبیتەوە ، بیڕای بیڕ ناویری جاریکیتر تخوونی ئەم گوندە بکەوێ ، هەر جارەی ناوی ئەم گوندەشی بەر گوێ بکەویتەوە موچڕکەی پیدا دیتەوە ، گەنجەکانیش گەلیکی پی پێ ئەکەنو لە دەستی رزگار ئەبن .

سی ، چل سالی پیش ئیستا یەکێ لە شاری کەرکوك هات لە گوندی ( خرابە دراو ° ) میوان ئەبێ ، ئەم کابرایە زۆر رالەخو بووە بە تایبەتی لە راست کچان خوهەلکیشو ئالچاغ بووە ، کابرای خانە خوێی چەند هاورێیەکی خوی

° خرابە دراو : ئەکەویتە سەرووی روژ ئاوای هەولیر نزیکی بیست کیلو مەتر دوور ئەبێ .

کو ئەکانەوەو پی‌یان ئەڵی : ئیوە چـــون ئەم میوانەم لە کول ئەکەنەوەو لە چنگیا رزگارم ئەکەن ؟. یەکی پی‌ی ئەلی : بو منی لی گەرێ ! هەلسا ئەم پیلانەی بو دانایەوەو وای لی کرد جاریکی‌تر نەگـەرریتەوە بوم ئەم دێیە . پاش ئەوەی بە دزی گیڕایانەوە گوندەکەو بە چەند جوریکیش ئازاریان‌دا ، لە جوخینان لە سەر گوشتی رووتی ووردە کوتیان لە پشـتی ئەسوی‌و ئەیان ووت : پشتت بونی هەشەکەی گرتووە کاتی فەردەکەت بە پشتت هەلگرتبو ئەویش هەر هاوار هاواری بوو لە بەر ئازاری پشتی ، لە سەر ئەو حالەش هەر ئەیووت : دەی چاوەکەم بونەکەی بچوینن تا ئاشـــکرا نەبی کە من هەشەکەم دزیوە . بەم شەوە رەوانی هەولیریان کردەوە ، ترسیشی هەر مابو دزی‌یەکەی لی ئاشکرابی تا خوی گەیاندەوە کەرکوك . کابرای خانە خویی زۆر سوپاسی کابرای خاوەن پیلانەکەی کرد کە لە دەس ئەو میوانـــە رزگاری کرد .

# ١٢ ـ دەستارر

هەر مالیك کە ساواریان لی بکردایە ، شەویك چەند کچیکی عازەبیان کوئەکردەوە بو ئەوەی ساوارەکەیان بە دەستارر بو لی بکەن ، بە تایبەتی ئەو کچانەی کە هەلبەستی دەستارریان زۆر ئەزانی ، ئەبوو بە ئاهەنگیکی زۆر خوش لەم مالەدا کچەکانی گەررەك‌و گوند سەربەخو روویان لەم مالە ئەکرد ، جاری‌وا ئەبوو لە ئیوارەوە تاکوو بەیانی بە دەم هەلبەستەوە دەستارریان

لی ئەکرد بی ئەوەی بیزاربن .

بەلام کە بیان زانیبوایە کچیکی وایان تیدا نییە هەلبەستیان بو بلی هیچیکیان نەئەچوون بو ئەم مالە ، ئەگەر چەند کچیکیشیان کو بکردایەوە ئەوانیش زوو پەرتەیان لی ئەکرد .

کە دەستارر لی کردنەکە گەرم بوایە ، هەر جارەی سێ کچ بەرانبەر یەك لە دەورەی دەستاررەکە دائەنیشتن ( لە بادینان دوو کچ و کوزێك دائەنیشتن ) ، هەر یەکە دەستیکیان بە باسکی دەستاررەکەوە ئەگرت و لە گەل یەکدا ئەیان سووراند ، یەکیکیان بە دەستەکەی تری ( بە جۆرەی پیویست ) هەر جارەی چەنگی ساواری ئەکردە ناو دەستاررەکە . کە ئەم سێیە ماندوو ئەبوون سێی تر جیگایان ئەگرتنەوە .

لە گەل دەستارر سووراندنەکەشدا یەکیکیان هەلبەستی تایبەتی دەستارر لی کردنی ئەووت لە سەر ئاوازەی تایبەتی خوی ، ئەوانەی تریش دیڕ بە دیڕ بە دوایدا ئەیان گیڕرایەوە .

بو وینە :

بادە بادە دایکی
تو دەدەمە میرەکی
میری من کی لەوانە
میرێ توو عەلۆ جوانە
عەلۆ جوانە من ناوی
عەلۆی بەینە سەر ئاوێ
لێی بڕشینین کرلاوێ

# ١٣ ـ دەمە تەقێ

دەمە تەقێ لە بەینی دوو ، سێ کەس ئەکرێ بو ئەوەی یەکیکیان ئەوەی‌تر بشکینیتەوە ، یا گاڵتەی پی بکا ، یا پەلاریکی لی بدا بی ئەوەی هەست پی بکا ، یا قسەیەکی دوو مەبەستی پی بڵی . بۆ وێنە :

١ ــ لە گوندی دارەبن دوو کەس ژن بە ژنی بە دایکی خویان ئەکەن ، هەر یەکەیان دایکی خوی ئەدا بە وەی‌تر ، یەکیکیان ناوی ( حەمە دەمین ) ، ئەوەی تریش ناوی ( حەمە تکویە ) . پاش ئەم رووداوە بە چەند رۆژێ دارەبەنی‌یەك ئەچی بو گوندی شیخ گەزنە ، خزمیکی ئەم دوو کەسەی کە ژن بە ژنی‌یان کردووە ماڵی لە گەزنەیە کە کابرای دارەبەنی ئەبینی‌و چاك‌و چونی لە گەڵ ئەکا ، لە دووایی‌دا پی‌ی ئەڵی : تو خوا حەمە دەمین‌و حەمە تکۆ چونن ؟ ، کابرای دەرەبەنی وەلامدا ئەڵی : بە خوای برام چیت لی بشارمەوە ، دایکی یەکیان گایە ! . گەزنەیی‌یەکە ئەتاسێ‌و بە سەر سۆرمانیکەوە ئەلی: لە سەر چی ؟!! خو یەکتریان نەکوشتووە ؟! ئەمجا کابرای دارەبەنی رووداوەکەی بو ئەگیڕیتەوەو دەس ئەکەن بە پیکەنین .

٢ ــ یەکی لە هەولیرەوە ئەیەوی بچی بو کەرکوك ، برادەریکی پی‌ی ئەڵی : کووە ئەچی بو کەرکوك ؟ ، کابراش

ئەلی : بە خوا بو مالی خزمێکم مالیانن لە ( تەپەی مەلا عبداللە ) یە گەررەکێکە لە کەرکوك ، بە تەپەش نازانم . کابرای شارەزای کەرکوك ئەبی پیی ئەلی : تەپە لە لای هیروەیە ، هەر کەسێ لە کەرکوك تو یەخـەی بگری شارەزایە بەو گەررەکە ، هەر بڵێی تەپـەو دەت بـەنی . کابرای ریبوار لە برادەرەکەی مڕ ئەبیتەوە ، ئەوەی تریش کە بیر لە واتای قســەکەی ئەکاتەوە ئەلی : برام مەبەستم ئەوەیە ئەتبەن بو تەپە .

## ١٤ ـ دیزەو گوزە

ئەم یاری‌یە لە بەینی ســـی گەنجدا ئەکرێ ، دوو لە تەنیشت یەکدا چوار چمکی لەسەر زەوی دائەنیشن‌و هەر یەکە دەستي ژوورەوی ئەخاتە ژیر رانەکانی‌و لە تەنیشتەکەی تری خویەوە دەری ئەکا ، ئەوەی تریش لە نیوانیاندا بە پیوە ئەوەستی‌و بە دەستی راستی دەستی چەپی دانیشـــتووەکەی دەستە راستی ئەگرێ ، بە دەستی چەپیشی دەستی راستی دانیشتووەکەی دەستە چەپی ئەگرێ‌و بەم چەشنە هەر دوو دانیشتووەکەی دەستە راست‌و دەستە چەپی هەڵ ئەگرێ‌و هەر دووەکەی پەررگە هاوار هاواریان پی‌ئەکەوی لە بەر ئازاری دەستەکانیان ، جاری وا ئەبی کابرای ناوەرراست یەکێکیش لە سەر ملی خوی هەڵ ئەگرێ جگە لە دووەکەی‌تر ئەنجا ئەم سەرو ئەو سەریان پی‌ئەکا بو ئەوەی بە هیزی خوی دەربخا لە ناو دانیشتووەکاندا کە سەیریان ئەکەن .

# ١٥ ـ راوه بەراز

ســی ، چل ســاڵ لەمەو پیش ئەم دەم ئاوو روبارانە وەکوو ئیستا دەشتیکی پان نەبوو ، کە کراون بە سەوزەو شینایی وە بە هوی مەکینە ئەکیلدرین‌و ئاو ئەدرین . بەڵکو هەموو یەك تەختە دارو باری خوڕسك دای پەشیبو لە هەموو لاین پالیان دابووە یەك‌و تیك ئالابوون بە تووتڕك‌و بی‌وحەسیرو کرتی‌وگەزو قامیش‌و قەزەم ، کە پڕ بوو لە بەرازو ریوی‌و چەقەڵ‌و گورگ . وە ببوون بە هوی مەترسییکی گەورە بو ئەو کەسانەی کە ریگایان ئەکەوتە ئەم چەم‌و دارستانانە وەکوو خاوەن چوار بیستان‌و سەیناغەکان‌و ئەو کەسانەی ئەچوون بۆ هەلاش بۆ گرتنی سەری خانووی تازە درووست کراو .

لە بەر ئەوە هەر کژەی چەند جارێ ، بە تایبەتی لە کانی هەڵسانی ئاوی رووبارەکان ، گەنج‌و پیاوەکانی گوندەکان خۆیان ئامـادە ئەکردو چـەند سەکیکی دژیان لە گەل خۆیاندا ئەبرد ، هەر یەکیکیش تفەنگیکی حوسکە ، یا رەشکەی هەبوایە لە گەل خۆیدا ئەی برد ، هەموو بۆ رابواردنز سەیران روویان ئەکردە چەم‌و دارستانەکان بەگۆرانی‌و بەستەو حەیران ئەڕۆیشتن بو راوە بەراز .

کە ئەگەیشتە ناو ئەم دارستانە تیك ئالاوانە ، ئەیان

کرد بە هەیهاوو هەرا وە بەردی گەورە گەورەیان هەڵئەدا بۆ ناو ئەو دارە تیك ئالاوانەدا کە بە خشە خش بە ناو دارەکاندا ئەڕۆیشتن ، سەگەکان هــەموو بە دووای بەردەکان ئەکەوتن و هیرشیان بۆ ناو قوپەنە دارەکان ئەبرد کە مروڤ بە هیچ جورێ توانای نەبوو بە ناویدا بڕوا لە بـەر بۆزیو قەبەیی ئەم دارانە کە هیچ ریگای لی نەبوو .

لە ژیر ئەم قوپەنە توتڕکانــە ئەبوو بە مررە مرری بەرازو وەررینی ســەگەکان کە بە گژ یەکدا ئەچوون ، چەند بەرازو دەعبای لە ژیر ئەم توترکانە هەبوایە هەموو دەر ئەپەررین خەڵکەکە بە سەر دار تووەکان ئەکەوتن و بە تفەنگو قەمیشی تیژ کراو لە بەرازەکانیان ئەدا کە سەگەکانیان بە دووایەوەبوون جـا چـەند بەرازێ ســەگەکان ئەیان خنکاندن ، چەندیکیش راوچی یەکان ئەیان کوشتن ، بەرازەکانیش چەند سەگیکیان ئەتوپاندو بریندازیان ئەکردن ، بەرازەکانی تریش ناچار روویان لە رووبارەکە ئەکردو بە مەلە لی ی ئەپەررینەوەو ئەم ناوچەیان بەجی ئەهیشت و روویان لە ناوچەیەکی تر ئەکردو لانەیان لی ئەکرد .

راوچی یەکان هەتا ئیوارە بەم چەشنە رایان ئەبوارد لە جیگایەکەوە بۆ جیگاییکی تر ئەچوون تا دەمەو رۆژ ئاوا ئەمجا بەرەو ئاوایی ئەگەررانەوە ، تا چەند رۆژی لە ناو گوندی باس هەر باســی راوە بەرازەکەیە ، فیسار بەرازیکی کوشت ، هەندە

نەمابو بەرازێ لە فیسکە بدا ، سەگەکەی فلان بەراز لی دا ، سەگی فلان کەس بەرازیکی خنکاند ... هتد .

بەلام ئیستا بە دەگمەن بەرازێ نابینرێ لە ناو ئەو چەمو دارستانانەدا ، کە هەر رۆژێ هەزارەها کەس هاتو چوی پیدا ئەکەن بەبی مەترسی لە دررندە ، لە بەر نەمانی ئەو دارو بارە خۆرسکانەی کە ئەبوون بە جێ‌نشینی ئەم دررندانەو لانەیان لە ژ بریدا ئەکرد .

# ١٦ ـ راوە ژیشك

چەند گەنجیکی گالتەچی کۆ ئەبنەوەو پیلانیك بۆ یەکیکی نەشـــارەزای ئەم یارییە دائەنینەوە بە تایبەتی لە گـەل ئەو شـارستانانەی کە بە میوانی ئەچنە گوندەکەیان کە شەوێ راوە ژیشکی پی بکەن .

گەنجەکان دۆستایەتی لەگەل شارستانیەکەدا ئەکەن و بە دەورەیدا ئەگەررین ، لە بەینی خۆیاندا ئەلین : دەبا ئیمشەو راوە ژیشـــکیك بکەین !. کابرای نەشارەزاش کە گوی لە قسەکەیـان ئەبیو شتی وای نەدیوە ئەلی : منیش لە گەل ئیوە دیم بۆ راوە ژیشك . گەنجەکانیش ئەم داوەیان هەر بو ئەوەو ئەلین : باشە. بەم شەوە خویان ریك ئەخەنو تەنەکەیەك لەگەل خـویان ئەبەنو روو لە دەشـت ئەکەن ، کە لە ئاوایی دوور ئەبنەوە بە شارستانەکە ئەلین : تو لە گرتنی ژیشك شارەزا نی ،

لیره دابیشه به بەردێ هەر لەم تەنەکە بدە ، تا ژیشکەکان لە گەل تەقە تەقی تەنەکەکە جێ‌لەق بن و رابکەن وە لە ژیر پرچکەکاندا دەرچن ، بەلام تو لە تەنەکە کوتانی خوت نەکەوێ ئیمەش ئەچین ئەو ژیشکانەی رائەکەن کۆیان ئەکەینەوە .

کابرا دەس ئەکا بە تەنەکە کوتانی خوی ، گەنجەکانیش دەس ئەکەن بە هەیهاو بو راپەرراندنی ژیشکەکان‌و هەر یەکەیان بە لایەکدا ئەررون‌و پەرتەی لی ئەکەن بە هاوارو هەیهاو ، تا لە شارستانەکە دوور ئەبنەوەو هەموو ئەگەررینەوە گوندی‌و ئەچنە دیوەخان ، تا درەنگ دائەنیشن ئەنجا پەرتەی لی ئەکەن‌و هەر یەکە لە مالی خوی لی رائەکشی‌و ئەنوێ تا بەیانی .

کابرای بەسەزمانیش لەم چۆلی‌یە هەر تەنەکە کوتانیەتی‌و چاوەرروانی گەررانەوەی هاوررێکانی ئەکا ، ئەگەر زوو هەست بە پیلانەکە بکا ئەوا ئەگەرریتەوە بو ئاوایی ئەگینا هەر لە سەر تەنەکە کوتانی خویدا بەردەوامە تا خەوی لی ئەکەوی لە سەر تەنەکە کوتانەکەدا ، یا هەر تەنەکە کوتانیەتی تا بەری بەیان .

جارێ یەکیکی شاری هەولیر هاتە دێی گاینج ، ئەم کارەیان پی‌کرد ، تا چەند سەعاتی هەر تەنەکەیان پیی کوتی ، گەنجەکانیش گەررانەوەو لە دیوەخان دانیشتن ، لە پاشان بانگیان کردەوەو ووتیان : ئیمشەو مانگە شەوە هیچ ژیشکیك نەهاتوەتە دەرەوە با بگەررینەوە ئاوایی .

# ١٧ ـ ساوار كوتان ( حەللاو )

لە دیهاتەكاندا كۆڕی ساوار كوتان خوشترین كۆڕە بو گەنجەكان ، هەر مالی لە گوندیكدا ساواریان بكوتابوایەوە گەنجەكانی گوندی هەموو رووبان تێ ئەكرد بو ساوار كوتان لە پاش بانگی شیوانەوە .

ساوارەكەیان ئەكردە ناو قولتیكی بازنەبیو هەر جارەی چوار گەنج یەكە كوتكیكیان بە دەستیانەوە ئەگرتو بازنەبی بە دەورەی قولتەكەدا ئەوەستانو دەستیان ئەكرد بە ساوار كوتان ، كە ئەم چینە ماندوو ئەبوون چواریتر جیگایان ئەگرتنەوە .

لە گەل ساوار كوتانەكەشدا ووردە ووردە ئەسوڕان بە دەورەی قولتەكەداو یەكی هەلبەستی ساوار كوتانی لە سەر ئاوازیكی تایبەتی ئەلی ، كە هەر نیوە دیڕیك لە هەلبەستەكە ئەلی ئەوانەیتر هەموو بە دووایەوە ئەیگیڕنەوە ، كچیكیش ئەو دەنكە گەنمانەی بە دەست ئەخستەوە ناو قولتەكە كە لە گەل كوتكەكاندا ئەپەڕین ، كچەكانی گوندیش هەموو بو سەیر كردنیان روو لەم مالە ئەكەن .

خاوەن ساوارەكە سەبەتەیەك یا دوو سەبەتە ترێ ، یا هەنجیر ، یا هەر میوەیەكی تری ئەكڕی پاش كوتابی هاتنی

ـــاوار كوتانەكە گەنجەكان دائەنیشتن‌و بە دڵیكی شاد ئەیان خواردو شەویان بەم جۆرە رائەشكاند تا بۆ نووستن پەرتەیان لی ئەكرد ، جا هەر شەوی ساواری ماڵیكیان ئەكوتیەوە .

ئەمەش چەند وینەیەكە لە هەڵبەستەكانی ساوار كوتان .

١ ــ هەڵبەستەكانی پیشەكی ساوار كوتان :ـ

حـەللاو حـەللاو
دە لیدە دە بكوتە

بیكە كا ، بـیدە بـا كـیژ لینی ، كوڕ بیخوا
دەن لە ناوی دەرینن چاوی لە بۆ خاتری ، زیّ بە دراوی
دەن لە رۆخی ، دەرینن پوخی لە بۆ خـاتری ، مەمك خۆخی
صوفی‌و مەلا حەی حەی دەكەن چاو لە كوفتەی هەر زەق دەكەن
جارو نویان ئاوا دەكەن !

بەقـــال هاتن هەشـــت‌و نۆ نە نانیان هیشـــت نە فرە دۆ
ئیمە چ بخوین بابە زۆ !

لە گـــەل تۆمـــە تۆ بكیژەوە چـاوی حیزت مەشـــیرەوە
ئەوەی لە كنت بینیرەوە بە كلدان‌و ئـاوینـــەوە
لە گەل تومـــە لە گـــەلیتە گەردن مـامزی بە قەریتە
ئافل دار بووم الۆت بووم شیتە

بەم جورە پیدا ئەچنە خوارەوە بە ( لە گەل تومە )
تا زیاتر لە دە دیڕ ئەلی . ئەمجا بە هەوەستی خوی هەرچی هاتە

بە دەمی نای گێڕیتەوە کە زۆربەیان هەڵبەستی دلدارین .

٢ ــ هەڵبەستەکانی دلداری کە زۆربەی هەڵبەستەکان ، هەر چەندی بنووسریتەوە تەواو نابی :

ــ[ دەمە تەقێ لە بەینی دایكو کچێك ]ــ

مالی تەنکەی لە قەد گردی  جەژەی پڕبوو داینا عەردی
دایکی گوتی ماچیان کردی

کچ :

بە پیش ماڵیان دا رابردم  جەژمم خوار بوو لۆی راست کردم
سەیان دڕبوو لی ی پاس کردم  دەستی راستی لە مل کردم
بە دەستي چەپ مەمکی گرتم  بە زۆرداری ماچی کردم

دایك :

ئەریَ کیژم چەند عەییاری  شەقت نەکەی وەك خەییاری
کیژ ماچ ناکریَ بە زۆرداری

کچ :

ئەریَ دایە مەمکە لومە  ئەو هەتیمە جەرگی خومە

دایك :

ئەریَ کیژم ناتکەم لومە  سەرم سپی بەو پشتم کومە
ئەو فیلانە لە مەز خومە

لە گەل بابت جارو بار بووم  لو جاحیلان تەبەزابووم

کچ :

ئەتو شیشی من کەبابم  ئەمن لە تو چێتر نابم

# ١٨ ـ سەر لی شێواندن و زمان تەتلە پێ کردن

گەورەو بچووك بە ژن و پیاوو کوڕو کچ ئەم یاری یە ئەکەن کە چەند کەسێ لە گەل یەك دائەنیشن ، یەکێکیان رستەیەك ئەڵی و داوا لە دانیشتووەکانی تر ئەکا کە هەر یەکێکیان لە سەر یەك و زوو زوو دوو بارەی بکەنەوە ، ئەمەش چەند وینەیەکە :

١ ــ قووری کووری کەر تێ قڕبوو .

٢ ــ سەد دەرزی ، دوو سەد دەرزی ، بە کونە دەرزی دایکم دا بەزی

٣ ــ شلە ساوار سێ شلە ساوار وەی بابە لەو سێ شلە ساوارەی .

٤ ــ پیرە ژنە گوو زەردە ، گوو زەردەم بە دەمــت ، دەمت بە گوو زەردەم .

٥ ــ شەکی سەررەشی پاشای سواری شەکی سەررەشی دایکم بوو .

٦ ــ سێ سنگم دەست دایی ، دووم کوتا کابێ ، یەکم دادایی .

٧ ـ چڵ چرگی چڵمن ، هــەر چڵ چرگی چڵمن ، مل رەقی مل رەوتی مل رنیاو .

# ١٩ ـ شەڕڕە قوڕڕ

هەموو مالی لە سەری پایزدا خانی سواق دان شتیکی پێویست بوو ، خویان ئامادە بکەن بۆ زستانی داهاتوو ، لە بەر ئەوە گەنجەکانی دێ بە دەستەوا هەر جارەی خانی یەکیکیان سواق ئەدا . کە لە سواق دانی هەر خانی‌یەك ئەبوونەوە خاوەن قوڕکاری‌یەکە شیویکی باشی بویان ئەکردو نانی نیوە رۆیان لەو مالە ئەخوارد .

لە بەیانیەوە ئەچوون بۆ قوڕڕ گرتنەوەو سواق دان ، کاتی لە قوڕڕکیشاندا ئەیانکرد بە گالتەوە هەرا کە هەستیان بە ماندوو بوونەکە نەئەکرد . کە یەکی بەسستی بزۆیشتایە ، خاوەن مالەکە ، یا وەستایەکە ، یا هەر یەکیکی‌تر توپەلە قوڕڕیکی لی ئەداو ئەی چرپاند . ئەویش توپەلە قوڕڕیکی بو ئەو کەسە ئەهـــاویشت کە بوی هاویشتبوو ، یا تکی لی‌ی هەبی ، جا پریشکی ئەم قوڕڕە بە چەند کەس بکەوتایە هەموو قوڕڕیان تێ ئەگرتەوەو بە دووای‌دا رایان ئەکرد ، ئەویش بەرگری ئەکردن‌و قوڕڕی بۆیان ئەهاویشـــتەوە ، تا وای لی ئەهات هەموو قوڕڕ کەرەکان تیـك بەر ئەبوون و لەشی یەکیان لە گەل قوڕڕ سواق ئەدا ، یا هـەموو قوڕڕ کەرەکان قسەیان ئەکردە یەك‌و بە گژ خـاوەن مالەکەدا بچن‌و بە توپەلە قوڕڕان لی‌ی بدەن . ئەگەر ئەویش زوو هەستی بە نیازی ئەوان بکردایە رای ئەکردو

خوی له ماڵه دراوسێیه‌کی ئه‌شارده‌وه ، له ماله‌که ئه‌مایه‌وه تا کوتاییی‌یان به سـوـاق دانه‌که ئه‌هینا ، ئه‌مجا ئه‌گه‌ررانه‌وه بۆ خزمه‌ت کردنیان‌و نان ئاماده کردن بویان .

## ٢٠ ـ شه‌رره کوفته

ئه‌م یاری‌یه تایبه‌تی‌یه به رۆژانی بووك گواستنه‌وه . که پاش گه‌یشتني بووك بو مـالی زاوا ، خه‌لکه‌که بو نان خواردن ئه‌چنه جوخینان یا ژیر ره‌شماڵ ، پاش نان خواردن هه‌ر یه‌که له گه‌نجه‌کان کوفته‌یه‌ك به ده‌سـتیه‌وه ئه‌گرێ‌و هیرش بو خوشه‌ویسترین هاوریکانی زاوا ئه‌به‌ن که برای زاوایه یا ئاموزایتی یا خزمیکی تری‌بی . ئه‌ویش که هه‌ست به نیازی گه‌نجه‌کان ئه‌کا له ده‌ستیان رائه‌کات ، گه‌نجه‌کان به دووای ئه‌که‌وزو له هه‌موو لایه‌کدا کوفته‌ی بو ئه‌هاوین‌و نازانی بو کام لا رابکا له ده‌ستیان . تا ماندوو ئه‌بن ئه‌مـه کاریتیانێ وه بیوزه‌وه‌ری ئه‌که‌ن له گه‌ڵ ئاوکه شیوو وورتکه بڕووشی کوفته‌کان ئه‌مجا وازی لی دینن .

## ٢١ ـ قاشویانی ( حه‌چان )

ئه‌م یاری‌یه له به‌ینی ( ١٠ ـ ٢٠ ) گه‌نج ئه‌کرێ ، هه‌ر یه‌که‌یان ( قاشۆ ° ) یی به ده‌ستیه‌وه ئه‌گرێ‌و ئه‌بن به دوو به‌شی

---

° قاشو : داریکی به قه‌ده‌ر گوپالیکی ئه‌ستوور ئه‌بی له دریژی‌و ئه‌ستووری ، گومکی خواره وه‌کوو ژماره ( ٦ ) ـه .

وەکوو یەك ، لە گوررە پانیکی گەورە کە بە زۆری گوررەپانی جێی جوخینانە ئەم یاری‌یە ئەکەن . وەکوو توپی پێ هەر بەشەی گولیکیان هەیە پی‌ی ئەلین ( هوڵ ) ، لە جیگای توپیش داریکی خڕ بە قەدەر هەناریکی گەورە بە کاردینن پی‌ی ئەلین ( گۆ ) هەر یەکە لەم دوو بەشە هەول ئەدەن گویەکە بخەنە ناو هولی بەشەکەی ترو بە ناویدا بڕوا بەشەکەی تریش بەرگریان ئەکاو بو گولەکەی ئەوانی ئەبەن . هەر یەکە لە یاری‌کەرەکان بە قاشویەکەی دەستی لە گویەکە ئەداو بو هولی بەشەکەی تری ئەبا ( نق ) ی وا بە هیز لە گویەکە ئەدەن بە گومکی قاشویەکەیان کە گویەکە بە هەر کەسێ بکەوێ جیگاییکی ئەشکینی جا سەری بێ یا قاچی بی .

زۆر جار لە کاتی یاری کردنا گویەکە بە یەکێ ئەکەوێ‌و لە بەر ئازاری لەشی لە هوش خوی ئەچی . لە بەر ئەوە هەر یەکیکی زۆر چوستت نەبوایە بو خو پاراستنی لەم ( نق ) ـە بە گوررانە لە خوی رانەئەبینی بچیتە ناو یاری‌یەکە .

لە دووایی دا کام بەش زۆرتر هولی لە بەشەکەی تر کردبی سەر ئەکەوی .

## ٢٢ ـ قاو قاوانی

( ٦ ـ ١٠ ) گەنج ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، بەشیکیان دائەچەقینەوە ( لە سەر هەر دوو دەستەکان‌و هەر دوو

پێ‌یەکانیان ئەوەستن) ، بەشەکەی تریش بە پێوە لە دەورەیان ئەسوڕێن‌و هەر یەکەیان هەوڵ ئەدا کلاوی یەکێ لە داچەقاوەکان ببا ، داچەقاوەکانیش لە سەر دەست‌و پێ‌یەکانیان ئەژوزو هێرش بۆ بەشەکەی‌تر ئەبەن تا لەقە لە یەکێکیان بدەن ، جا ئەگەر لەقەیان لە هەر یەکێکی بەشەکەی تردا ئەوا بە پیچەوانە لەقە لێ دراوەکەو هاوبەشەکانی دائەچەقینەوەو تێ‌ئەکەون ، بەشەکەی تریش بە دەورەیاندا ئەسوڕێن بۆ کلاو بردن . بەلام ئەگەر داچەقاوەکان نەیان توانی لەقە لە هیچیکیان بدەن ئەوا لە پڕ یەکێ لە وەستاوەکان بۆی هەڵکەوی کلاوی یەکێ لە داچەقاوەکان ئەباو ئەلێ : (قاو) ، خۆی‌و هاوبەشەکانی رائەکەن بو جیکاییکی دیار کراو جا دیوارێ یا هەر شتیکی‌تر . داچەقاوەکانیش هەموو هەڵ ئەستنەوە سەر پێ‌و بە دووای‌دا رائەکەن ، ئەوەی قاوەکەی بردووە کە بزانێ پاش ئەکەوێ‌و ئەوانەی‌تر ئەی‌گرن ، قاوەکە ئەدا بە یەکێ لە هاوبەشەکانی ئەویش ئەیدا بە یەکێکی‌تر هەر وەها لە دەست یەکیکەوە ئەچیتە دەست یەکیکی‌تر . بەشەکەی تریش هەموو بە دووای ئەو کەسە رائەکەن کە قاوەکەی لا بێ بەم چەشنە تا ئەگەنە جیکا دیارکراوەکە ، ئەگەر ئەوەی قاوەکەی لە دەستە بکیرێ پیش ئەوەی بکاتە دیوارەکە ئەوا ئەو کەسەی گرتوویەتی سواری پشتی ئەبێ تا ئەکەنە دیوارەکەو گیراوەکە خۆی‌و هاوبەشەکانی دائەچەقینەوەو لەسەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە . بەلام ئەگەر نەگیرا تا ئەگەنە دیوارەکە ئەوا هەر

یەکە لە داچەقاوەکان یەکێکی بەشەکەی‌تر بە کۆڵ هەڵئەگرن تا ئەگەڕێنەوە جێگاکەی خۆیان کە لێوە هاتبوون ، لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوەو هەر بەشەکەی پێشوو دائەچەقێنەوە .

## ٢٣ ـ قسەی نەستەق

کە چەند کەسێ کوئەبنەوە کانێکی خۆش بەم قسانە ئەبەنە سەر ، بە تایبەتی لە شەوانی زستاندا کە بە ریزە هەر یەکە قسەیەك ئەگێڕنەوەو چەند جارێ نۆرەیان دێتەوە سەر ، هەموو شل ئەبن لە بەر پێکەنین .

ئەمەش چەند وینەیەکیتی :

١ ـ یەکێکی گێل و گوار ئەبێ بە سەرباز فرێ عەرەبی نەئەزانی ، لە بەر ئەوە عەریفەکەی فێری چەند پرسیارو وەلامێکی ئەکا ، یەکێ لەم فێرکردنەی ئەمە بوو : ئەگەر پرسیان ( کم عمرك )؟ بڵێ ( ١٧ سنة ) . کە ووتی ( کم صار لك بالخدمة ) ؟ بڵێ ( سنة واحدة ) . کە ووتی ( تطوعت من اجل الوطن او للراتب ) ؟ بڵێ ( الاثنین معاً ) . سەربازەکە لە دڵی خۆیدا ئەڵێ : جاری یەکەم ئەڵێم ( ١٩ سنة ) . جاری دووەم ئەڵێم : ( سنة واحدة ) . جاری سێیەم ئەڵێم ( الاثنين معاً ) .

بەختەو نیو چەوانی ئەم هێرو هورزە ڕۆژی پێنج شەمە لە کانی پشکنینی جلو بەرگدا ئەفسەرەکە بە شەڕزەی ئەیبینێ‌و پێی ئەڵێ: [ ولك هاي كم صار لك بالخدمة ؟ ] ئەویش وەلامەکەی پێشووی لە دڵی خۆیدا بە ریزە گرتووەو ئەڵێ : ( ١٩ ســـنە سيدي ) . ئەفسەرەکە ئەڵێ : ( كم عمرك ؟ ) ئەویش ئەڵێ : ( سنة واحدة سيدي ) ئەفسەرەکە لێی مۆر ئەبێتەوەو خوی کف ئەکاتەوەو ئەڵێ : ( انا حمار لو بقر گدامك ؟ ) . ئەویش ئەڵێ ( الاثنين معاً سيدي ) .

٢ ـ سەپانێك لە گەڵ ئاغاکەی لە جۆخینان ڕەوسەیان بۆ ئەکرد ئاغا بە سەپانەکەی ووت : بڕۆ لە ماڵەوە شوژنێ بێنە دەرکی خرارەکەی پێ بدروین ؟. سەپانەکەش کە ئەچێ تەنیا کچێکی ئاغاکەی لە ماڵەوە ئەبێ ، بە کچەکە ئەڵێ : ماچێکم بدێ ؟ کچەکەش ئەڵێ : کوڕە بڕۆ هەی ســـەگی سەگباب . سەپانەکە ئەڵێ : دیــارە بــاوەڕم پێ نــاکەی وەرە تا بە باوکت بڵێم ، کچەکە لە گەڵ خوی ئەباتە بەر دەرگای حەوشەو لە دوورەوە ئاغاکەی دیارە لە جوخینان ، هــاوار ئەکا ە ئاغاکەی‌و ئەڵێ : مامە وا نام داتی ؟. ئاغاکەش ئەڵێ کچی بیدێ هەی . . . ، کچەکە ناچار ماچێکی ئەداتی ، ئەمجا شوژنەکە بو ئاغاکەی ئەبا .

٣ـــ کابرایەکی ترسنۆك خەنجەرێك‌و دەمانچەیەکی لا ئەبێ ، بە ڕێگایەکی چوڵدا ئەڕوا لە پڕ کابرایەکی سەلتی تووش ئەبێ هەچ

جوره چەکێکی لا نابی ، بە کابرای چەکدار ئەڵێ : کوڕە رووت بە؟. ئەویش خەنجەرەکە بە دەستی ئەگرێو دەمانچەکەش بە دەستەکەی تری بەبێ ئەوەی بیان وەشێنێ ، کابرای سەڵت دەس ئەکانە گاشە بەردێکو بوی ئەچێو ئەڵێ : سەگباب پێت ئەلیم رووت بە ؟. چەکدارەکە لە ترسا هەموو چەکەکانی بو دائەنێو کابرا ئەیان باو ئەڕوا .

رووت کراوەکە کە ئەگەڕێتەوە ناو دۆستو برادەرەکانی پێی ئەلێن کوا چەکەکانت ؟. ئەڵێ : رێگرێ لێی ساندم . ئەلێن : کوڕە تو چۆن بۆی رووت بووی ؟. ئەلێ : باوکم دەستێکم خەنجەر بوو دەستێکیش دەمانچە : خۆ کەلەباب نەبووم بە دەندووك شەڕ بکەم.

# ٢٤ ـ کلاو دررکانی

ئەم یاری‌یە تایبەتی‌یە بە شوانەکان ، کە لە دەشتێکدا کۆ ئەبنەوە یەکێکیان گۆپالەکەی خۆی بە پەللار دوور هەڵ ئەدا ، لە کوێ کەوتەوە ئەچێ لەو جێگایە ئەی‌چەقێنێ ، شوانەکانی تریش لە جێگای خۆیانەوە گۆپالەکانی خۆیان بۆ چەقاوەکە هەڵ ئەدەن ، هەر یەکێ لێی‌بدا خۆی رزگار ئەکاو جارێکی‌تر نایهاوێ ، ئەوانەی تریش بە نوبە هەر یەکە چەند جارێ

گوپاڵەکانیان بو گـوپاڵە چەناوەکە هەل ئەدەنو هەر یەکی لی ی
بدا رزگار ئەبی ، تا لە دووایی‌دا تەنیا یەکی ئەمینیتەوە کە هیچ
جاری لە گۆپاڵە چەقاوەکە نادا ، ئەوانیش بە هەموویان کلاوەکەی
لی ئەسینن‌و بە گۆپالان هەر جارەی بۆ لاییکی هەل ئەدەن ،
خاوەنەکەشی بەم لاو بەو لادا رائەکا بە دووایدا ، بەلام هەر
یەکیکیان کە بو ئەوەی‌تر هەلی ئەدا ئەلی : ئەوەی بدا دایکی
بدا . لە بەر ئەوە هـــەر یەکەیان پیش ئەوەی خاوەنەکەی
بیگاتی بو یەکیـــکی تری هەل ئەداو جونەکە لە خوی دوور
ئەخاتەوە ، بەم جورە تا کلاوەکە پارچە پارچـــە ئەبی ، یا
خاوەنەکەی چوست‌بی زوو ئەی‌گریتەوە پیش ئەوەی بدڕێ . .

## ٢٥ ـ کەرو ئاشەوان

ئەم یاری‌یە لە شەوانی دریژی زستاندا لە حوجرەی
فەقی‌یان‌و دیوەخان‌و ئاهەنگی بووك گواســـتنەوەدا ئەکرا ، کە
گەنجەکان هەستیان بە یەکی ئەکرد شارەزای ئەم یاری‌یە نەبوایە
بە چەند فڕوفیل وایان لی ئەکرد کە لەم یاری‌یەدا بەشداربی‌و
بیی بە ئاش کە هەر یەکە لە گەنجەکان ئەلی : من ئەبم بە ئاش
ســـەردارەکەیان ئەلی : نەە ، تو بیە بە ماکەر ، توش بیە بە
ئاشەوان ، توش بیە بە خاوەنی باراش ، خوشم ئەبم بە ئاشوەستا

تا وا لە نەشارەزایەکە ئەکەن خۆی داوای ئەوە ئەکا بێ بە ئاش ، لای وایە بێ ئازارترە چەنکو هەموویان داوایان ئەکرد بێن بە ئاش .

کراسێکی ژنانەی درێژی بە باخەڵ ئەکەنە بەر ئاشەوانو بالیفێکی لە ژێر کراسەکەوە لە سکی ئەبەستنو ئەبێ بە کابرایەکی تەنگەسـتوور ، دووانیش ئەبن بە کەر کە یەکێکیان بە پێوە ئەوەستێو ئەوەی تریش لە پشتی دائەچەمێتەوەو سەری بە پشتی ئەوی پیشەوە ئەکا ، پارچە پەڕۆکێکی گەورە یا جاجمێکیان بە سەر دائەدەنو دایان ئەپۆشن . بوژیەکیش ئەدەنە دەس ئاشەکەو پێی ئەڵێن : تۆ دەمت بخـــە ناو ئەم بۆژبەو هـــەر بڵێ : ( پپ ، پپ ، پپ ... ) .

ئاشـەوان بە ناو ( دانیشتووەکان * ) دا ئەگەڕێ هەر جارەی لە پڕ لەقەیەك لە رانی یا لە پێی یەکێکیان ئەداو ئەڵێ : هەها ئەوە کونە جرجە شەپڵتەیەکی لیدە ؟ یەکی بە دووایەوەیە دوو سێ لەقە لە دانیشتوەکە ئەدا ، لە یەکێکیتر ئەداو ئەڵێ : ئەی سندانت لێدا ئەوەش کونە مشکە شەپڵتەیەکی لیدە ؟ بەم چەشـنە تا ئەڕۆن هەر بە لەقە لە دانیشتوەکان ئەدەن ، لە پڕ کوڕی ئاشەوانەکە لە بەر دەرگاوە بانگ ئەکا ئەڵێ : باوکە باراش هات !. باوکی ئەڵێ : باراشـــەکە چییە ؟. کوڕەکە ئەڵێ :

* ئەوانەی سەیریان ئەکەنو لە یارییەکە بەشدار نین .

گەنمــە . باوكی ئەلی : كەرەكەی چیبە ؟. كوررەكە ئەلی : نێرەكەرە . باوكی ئەلی : بۆی درشت لی‌كە .

پاش نەختی كوڕەكە دووبارە ئەڵی : باوكە باراش هات باوكی ئەلی : باراشەكە چیبە ؟. كوڕەكە ئەڵی : ساوارە . باوكی ئەڵی : كەرەكەی چیبە ؟. كوڕەكە ئەلی : ماكەرە . بـاوكی ئەڵی : بۆی بكە بە ئارد . ئاشەوان لە خۆشیان گەش ئەبیتەوەو لە تاوا بەم لاو بەو لادا ئەگەڕێو لە بەر خویدا ووردە گۆرانی ئەڵی ، كە خاوەنی باراشـــەكە لە كەرەكەی دوور ئەبیتەوە ئاشەوان كەوچكیكی گەورەی دۆ ( ئەســـكو ) بە هەر دوو دەستەكاني لە بەینی هەردوو رانی خویدا ئەگرێو سەرەكەشی بۆ پیشەوە دریژ ئەكاو یاغر یاغر بۆ لای كەرەكە ئەچیو ئەسكویەكە لە پاشەوەی كەرەكە ئەسوی ، هەموو دانیشتووەكان دەس ئەكەن بە پیكەنین ، ئاشەكەش لە بەر پیكەنین نەختی لە ( پپ پپەكەی ) ئەكەوێ ، ( ئاش وەســتا ) خۆی تەنگاو ئەكاو ئەڵی ئەهـا ئاشەكە تیك چوو دەنگی چاك نابێ ، ئەچیتە لای ئاشــــەكەو ( ئاش وەستاكە لە پیشا ئاولەپی هەردوو دەستەكانی بە تەنی ساج رەش كردووە ) دەستی بە رووی ئاشەكەدا ئەسووێو رووی رەش ئەكا ، هەموو خەڵكەكە پێ‌ئەكەنن ، ئاشەكەش هەر سەیری كەرو ئاشەوان ئەكا لە پیكەنینی خۆی ناكەوێ ئاش وەستا بەم جورە هەر خەریكە رووی ئاشـــەكە رەش ئـەكا ، كەرووی

ئەگریێو رەشی ئەکاو ئەڵی : ئەوە بۆ ئیش ناکا ؟!. هەرووها گوێەکانیو چەناگەو کوڵمی ، تا هەموو رووی رەش ئەکا .

خاوەن باراش بە سەر ئاشەوانەکەدا ئەچی کە بە کەرەکەیەوە خەریك ئەبی ، ئەیێ بە هاتو هاواری ئاشەوانو خاوەنی کەرەکە ، هەر چەندی ئاشەکە لە سەر روو رەشی خۆی بە کەرو ئاشەوانەکە پیئەکەنی ، دانیشتوەکان هەندەیتر لە بەر پیکەنین بە حالی ئاشەکە لە سەر پشت ئەکەون ، کە هەموو رووی رەش کراوەو هەر ئەڵی ( پپ ، پپ پپ ) . ئەمجا دانیشتووەکان ئەڵین : کوڕینە ئەم ئاشە چەند دووکەلی گرتووە ؟ ئاشەکەش کە دەستی بە رووی خۆیدا ئەسوێ هەموو دەستی رەش ئەبی ، ئاش وەستا رائەکاو ئاش بە دووای ئەکەوێ بە جنیودان ، تا بە هەر جورێ هەموو دانیشتووەکان دلی ئاشەکە ئەدەنەوەو چاوی ئەشون . بەلام بیکەلکە ، تا پاش چەند رۆژیکی تریش هەر جارێ ئاشەکە ئاش وەستا ئەبینی جنیوی پیئەداو لە دلی دەرناچی ، چەنکو لە پیش هەندە خەلکە ئابڕووی بردووەو کردوویە بە گاڵتە .

## ٢٦ ـ کەري کەر هاژو

( ٦ ـ ١٤ ) گەنج ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك ، هەر بەشەی سەرۆکیکی هەیە . هەردوو سەردارەکە ( هۆپ هۆپ

ئەرەتۆپ ) ئەکەن ، کامیان تێبکەوێ هاوبەشەکانی نەختێ لێیان دوور ئەبنەوەو پشتیان ئەخەنە بەشە سەرکەوتووەکەو بە پێوە ئەوەستن بێ ئەوەی ئاوڕ بو پاشەوە بدەنەوە .

هەر جارەی یەکێ لە بەشە سەرکەوتووەکە ئەچێ سەری بە پشتی یەکێ لە تێکەوتووەکان ئەکا ، سەرۆکەکان بە تێکەوتووەکە ئەڵێن : کێت داژواتێ ؟. ئەویش ناوی یەکێ لە سەرکەوتووەکان ئەڵێ ، ئەگەر ناوی ئەو کەسەبێ کە سەری بە پشتیەوە ناوە ئەوا ئەوەی پشتی بە کۆڵ هەڵی ئەگرێ تاجیگایەکی دیارکراوو ئەیگێڕێتەوە . جیگاکەی خۆی ، بەلام ئەگەر ناوی ئەو نەبێ ئەوا تێکەوتووەکە ئەوەی پشتی بە کۆڵ هەڵ ئەگرێ تا جیگا دیار کراوەکەو ئەیگێڕێتەوە ئەمجا یەکیکیتر لە سەرکەوتووەکان سەری بە پشتی یەکێ لە تێکەوتووەکان ئەکا

بەم چەشنە تا هەموو سەرکەوتووەکان یەکە یەکە سەریان بە پشتی تیکەوتووەکان ئەکەن جا لە پشت ئەکرێن یا لە پشتیان ئەکەن .

ئەمجا بە پێچەوانە بەشەکەیتر ئەچنە پیشەوەو بەشە تیکەوتووەکەی پیشوو یەکە یەکە سەر بە پشتی تیکەوتووەکانی تازە ئەکەن . بەم چەشنە هەر جارەی بەشیکیان تێئەکەون تا لە یاری تیر ئەبن .

# ٢٧ ـ كەللامستانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٢ ـ ١٠ ) گەنج ئەکرێ ، ئەبن بە دوو بەش . نۆ پارچە لە کلاوو دەستەسڕ کۆئەکەنەوەو لە پیش خۆیاندا لە سەر زەوی دایان ئەنێن ، یەکێ لە گەنجەکان ئەبێ بە وەستا ئەنگوستیلەیەك لە دەستیدا ئەگری‌و دەتی یەکە یەکە بە ژیر هەمــوو پارچەکاندا ئەگێری‌و لە ژیر یەکێك لە پارچەکان ئەنگوستیلەکە ئەشاریتەوە ، بەشەکەی تریش بە دووای ئەنگوستیلەکەدا ئەگەڕین‌و شکی خۆیان ئەگرن لەو پارچەیەی کە گومانی لی بکەن ئەنگوستیلەکەی تیدایە بە مەرجی لە دوو پارچە زیاتر بۆ خۆیان نەبژیرن لەم شکانەی کە گرتوویانە ، ئەوانەی تریش یەکە یەکە لە سەر زەوی بە دەست هەڵئەگرنەوەو ئەڵین : ئەوە بچی . ئەگەر ئەنگوســتیلەکە لە ناو یەکــێ لەم دوو پارچەیەدابێ کە گرتوویانە ئەوا یەکیکیان ئەبێ بە وەســتاو ئەنگوستیلەکە دائەگریتەوە ( ئەی‌شاریتەوە ) وەکوو وەســتای پیشـوو ، بەشەکەی تریش بە دووایدا ئەگەڕین . بەلام ئەگەر ئەنگوســتیلەکە لەم دوو پارچەیەدا نەبی کە گرتوویانە وە لە پارچەیەکی‌تر دەر بچی کە ئەی‌چوێنن ئەوا ئەو پارچانەی لە ســەر زەوی مایتەوە لەگەڵ ئەم پارچەی ئەنگوســتیلەکەی تیدابوو هەمووی ئەژمیرن بو ئەو بەشەی کە دایانگرتبو ، وەستایەکە هەمیشە ئەنگوستیلەکە ئەشاریتەوەو بەشەکەی تریش بە دوایدا

ئەگەڕێن تا جارێ لەم پارچەدا ئەیدۆزنەوە کە شـــکیان لی‌ی گرتووە ، بەلام بەشەکەی پیشوو چەند ژمارەیان هەبی بۆیان ئەمینی بو جاریکی‌تر کە ئەبن بە وەستا .

ئەم بەشەش ئەیشارنەوە تا ئەدۆزریتەوەو هەر وەکوو ئەوانەی پیشوو چەند ژمـارەیان هەبی بۆیان ئەمینی . جا لەم دوو بەشە کامیان لە پیشدا ( دەستەگوڵ ° ) تەواو بکا ئەنگوستیلەکە لە شەش پارچەدا ئەشاریتەوە هەر بەشەی سێ پارچە ، جا ئەگەر لەو سێ‌بە دەرچی کە بەشەکەی‌تر ئەیان بژیرن ئەوا ئەو بەشەی کە دایان گرتبوو ( ٢٥ ) ژمارە بۆ پاشەوە ئەگەڕینەوە واتە لە پەنجا بە دەست ئەگەڕینەوە بۆ ( ٢٥ )ی دەست‌و بەشەکەی‌تر ئەبن بە وەستا . بەلام ئەگەر ئەنگوستیلەکە لەم سێ شکە دەرنەچی کە گرتبوویان ئەوا تی‌ئەکەون جـا لە سەر مریشك ، یا هەر خواردنیکی تریان کردبی سەرکەوتووەکان لە تیکەوتووەکانی وەر ئەگرن‌و بە سـەر هەموو دانیشتووەکانی دابەش ئەکەن‌و لە گەل یەکدا ئەی‌خون .

---

°) دەستە گوڵ : ژمارەیەکە لە ( ١٠٠ ) تەواو ئەبی ، پەنجای بە پی‌یەو پەنجای بە دەست .

# ٢٨ - کەلەك دابررین

( ٦ ـ ١٤ ) گەنج ئەبن بە دوو بەشی وەکوو یەك قومـەتە خولیکی گەورە ئەکەن‌و بەردیکی هەندەی ناولەپیکی ئەخەنە ناویەوە ، بەشیکیان تی‌ئەکەوی‌و پاریزگاری قومەتە خولەکە ئەکەن‌و هەوڵ ئەدەن لەقە لە بەشەکەی‌تر بدەن کە نزیکیان ئەبنەوە بو ئەوەی تی‌بکەون ، بەشەکەی تریش هەوڵ ئەدەن بەردەکەی ناو قومەتەکە دەربخەن ، هەر یەکی لە پاریزگارەکان لە قومەتەکە دوور بیتەوەو یەکی لە هـــیرش بەرەکان بە بەبێ قومـەتەکەو دوور کەوتووەکەدا بڕوا ( بەبی ئەوەی لەقەی لی بدرێ ) ئەڵی : بررر . ئەوا بڕکراوەکەی پاریزگار لە یاری‌یەکە دەرئەچی . هەر یەکیش لە بەشە پاریزگارەکە لەقە لە یەکی بدا لە بەشەکەی‌تر لەقە لی دراوەکە لە یاری‌یەکە دەرئەچی . بەم جورە یەکە یەکە لەیاری‌یەکە دەر ئەچن تا تەنیا یەکی لە هیرش بەرەکان ئەمینیتەوە لەقـەی لی نەدرابێ ئەویش ئەبێ بە ( چیلە بەکەڵ )و هەموو ئەو پاریزگارانەی کە ماونـــەتەوە بە دوایدا راتەکەن ، ئەگەر توانیان لەقەی لی بدەن ئەوا پاریزگارەکان گاسنیکیان لە هیرش بەرەکاندا ئەبی ، ئەگەر نەشیان توانی لەقەی لیدەن تا ئەگاتە قومـەتە خۆڵەکەو بە لەقە بەردەکەی لە ناویدا دەرئەخا ( کەلەك ئەڕوخینی )و بەشە هیرش بەرەکان گاسنیکیان لە بەشەکەی‌تر ئەبی . ئەمجا بە پیچەوانە بەشـــەکەی‌تر هیرش

ئەبەن‌و ئەم بەشەش ئەبن بە پاریزگاری قومەتەکەو لە سەریەوە دەس بە یاری‌یەکە ئەکەنەوە . بەم چەشنە هەر جارەی بەشیکیان ئەبن بە پاریزگارو بەشەکەی تریش هیرش بو قومەتەکە ئەبن .

هـــەر کاتی هیرش بەرەکان بەردەکە لە ناو قومەتەکە دەربخەن ( کەلەك بڕوخینن ) کاسیکیان لە بەشە پاریزگارەکە ئەبی جا هەر چەندی لە هەردوو بەشدا مابنەوە . لە دووایی‌دا کە لە یـاری تیرئەبن کام بەش کاســـیان زۆرتربی ئەو بەش سەرئەکەوێ .

## ٢٩ ـ کیلە بەردانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٢ ـ ١٠ ) گەنج ئەکرێ ، ئەبن بە دوو بەش ، ئەم دوو بەشە نزیکەی ( ٢٠ ) هەنگاو لە یەك دوور ئەبنەوە ، هەر بەشی چوار ( کیل * ) بۆ خۆی لە سەر زەویدا ئەچـەقینی ، یەکەم کیل لە پیشەوەیە ئەی بە مەلا ، مەلا ژن دوو هەنگاو لە پشت مەلایە ، دوو کیلەکەی تریش لە تەنیشتي راســتو نەنیشتی چەپی مەلا ژن ئەچەقینن کە هەر یەکەیان دوو هەنگاو لە مەلا ژن دوور ئەبن .

---

*) کیل : بەردیکی پانە بەرینایی‌یەکەی بستیك ئەبی‌و دریژایی‌یەکەشی لە بستیك زیاترە

بەشیکیان لە پیشدا دەس بە یاری ئەکەن‌و هەر یەکەیان لە پش مـەلایەکەی خۆیانەوە بەردێ هەل ئەدەن بو کیلەکانی بەشەکەی‌تر ( پیویستە لە پیش هەموو کیلەکان مەلا بخەن ئەجا کیلەکانی‌تر .) هەر یەکەیان چەند کیل بخا هەندە بەردەی بۆ زیاد ئەبی کە بیهاویَ ، ئەگەر یەکی بە تەنیا هەموو کیلەکانی بەشەکەی‌تری خست ئەوا پینج گاسن‌و کورتانیکیان لە بەشەکەی‌تر ئەبی ، ئەگەر بە هەمووشیان هەموو کیلەکانی بەشەکەی تریان خست پیش ئەوەی بەشەکەی‌تر هیچ کیلیکی ئەوان بخەن ئەوا گاسـنیك‌و کورتانیکیان لە بەشەکەی‌تر ئەبی ، بەلام کە هەموو بەردەکانی خۆیان هاویشت‌و هـەموو کیلەکانیان نەخست ئەوا نۆرەی بەشەکەی ترە ئەوانیش هەر یەکەیان بەردی خـۆی بۆ کیلەکانی ئەمانە هەل ئەدا ، ئەگەر هەموو کیلەکانیان خست بەلام ( چەند کیلیکی خویان کەوتبی ) ئەوا تەنیا گاسنکیان لەم بەشە ئەبی ، بەلام کە هەموو بەردەکانی خویان هاویشتە نەیانتوانی هەموو کیلەکان بخەن ئەگەر تەنیا یەك کیلیش مابی ئەوا بەشەکەی‌تر دەس بە یاری ئەکەن‌و هەر یەکەیان چەند بەردی بیَ بەردەکانی خوی ئەهاویَ‌و چەندی‌تر بخـا هەندە بەردەی تریشی بۆ زیاد ئەبی . بەم چەشـنە تا بەشیکیان هەموو کیلەکانی بەشەکەی‌تر ئەخەن ، ئەوا گاسنیکیان لە بەشەکەی‌تر ئەبی .

لە سەریەوە دەس بە یاری ئەکەنەوەو جیگایان ئەگوزنەوە هەر بەشیکیا ئەچنە جیگای بەشەکەی‌تر‌و کیلەکان ئەچەقیننەوە ،

بەشە تێ‌کەوتووەکە کەگاسنیان تێ‌کراوە لە پێشا دەس بە یاری ئەکـەن‌و بەردەکانی خۆیان ئەهاوێن چەنکو ( زگیان سوتاوە ) دۆزاندوویانە .

جـــاری‌وا ئەبێ یەکێ کە بەردەکەی بۆ کیلەکانی بەشەکەی‌تر هەل ئەدا دوو کیل بە جارێ ئەخا ( ئەپەڕێنێ )و دوو بەردی بە جارێ بۆ زیاد ئەبێ کە پیهاوێ واتە ئەگەر یەك بەردی بێ ئەبێ بە ســـێ بەردی ( بە مەرجی لەو کاتەی کە بەردەکە هەڵئەدا بلێ ( کیل‌و ویل ) ) ئەگینا تەنیا بەردیکی بۆ زیاد ئەبێ‌و یەکێ لە کیلەکان ئەچـەقیننەوە . بەم چەشنە تا لە یاری تێرئەبن جا کام بەش زیاتر گاسنی کردبێ سەر ئەکەوێ .

# ٣٠ ـ کورزکورزانێ

کورز : چـــەند پارچە لبادو پەڕۆکیکی تیك ئالاوە وەکوو تۆپێ لێ ئەکرێ ، تـا بتوانن توندو رەقێ ئەکەن تا لە کاتی وەشاندندا بە ئازاربێ ، ئەم سەرەکە پەڕۆیە بە سەری تیلمە پەرۆکێ یا ئاوە بەنێ ئەخەن کە دریژاییەکەی لا بالیك بێ ، سەرەکەی تریشی بە دەستەوە ئەگرن .

ئەم یارییە لە بەینێ ( ٤ ـ ١٢ ) گەنج ئەکرێ ، یەکێ ئەبێ بە ســەردارو کورزەکە بە دەستیەوە ئەگرێ ، ئەوانەی

تریش هەموو لە بەرانبەریدا ئەوەستن ، سەردارەکە ناوی مەلی لە دلی خویدا ئەگریٚو یەکە یەکە سەری گورزەکەیان ئەخاتە ناو دەستیٚو ئەلی ئەمە چییە لە دەستم ؟ ئەوانیش هەر یەکە لە وەلامدا ناوی مەلی ئەلین ، ئەگەر مەلەکە قەتی بی کە سەردارەکە لە دلی خویدا گرتوویەتی ، هەر کەسی لە وەلامدا ووتی قەتی ئەوا سەردارەکە گورزەکەی ئەداتیٚو ئەلی : لیدە بە گیانی قەتی ، ئەویش بە دووای یاری کەرەکانیتر رائەکاو بە گورزەکە لی‌یان ئەدا ، کە لە سەردارەکە دوور ئەبیتەوە سەردارەکە ئەلی : کەنم گورز جو بەلاو .

ئەوەی گورزەکەی لە دەستە بە پەلە رائەکاو گورزەکە ئەدانەوە دەست سەردارەکە . بەلام ئەگەر نەیتوانی گورزەکە بکەیەنیتەوە دەس سەردارەکەو پیش ئەوەی بیگاتی ئەوانەیتر بیگرن ئەوا بە هەموویان رای ئەگرنە بەر مستان تا بە هەر جوری خونیٚ ئەگەیەنیتەوە سەردارەکەو گورزەکەی تەسلیم ئەکانەوەو ئەلی : قەتیٚ . ئەگەر گورزەکەشی دایەوە سەردارەکەو ناوی مەلەکەی لە یاد نەبی ئەوا هەمیشە ئەی‌گرنەوەو بە مستان لی‌ی ئەدەنو ئازاری ئەدەن تا ناوی مەلەکەی دیتەوە یادو بە سەردارەکەی ئەلی ئەمجا بەری ئەدەنو لە سەریەوە دەس بە یارییەکە ئەکەنەوە .

# ٣١ ـ گوریسی بن سنگی

( ٥ ـ ١٠ ) گەنج هەر یەکە گورزیکیان بە دەستەوەیە سنگی لە زەوی ئەکوتن و سەری گوریسیکی دوو بال دریژی پیوە ئەبەستن ، یەکیك تێ ئەکەوێ هەموو گورزەکان لە یاری کەرەکان ئەسینێ و لە تەنیشت سنگەکە ئەیانخاتە سەر زەوی و سەرەکەی تری گوریسەکە بە دەستیەوە ئەگرێ و ئەلێ : ( توز بەری ئاسمانی گرت ) واتە یاری یەکە دەستی پێ کرا . هەموو بە پەلە لە سنگەکە دوور ئەبنەوە ، تێ کەوتووەکەش سەری گوریسەکە ئەگرێ و بە دەورەی سنگەکەدا ئەسوڕێ و پاریزگاری گورزەکان ئەکاو ناهیڵێ ئەوانەی تر بیان بەن ، ئەوانەی تریش بە دەورەیدا ئەسوڕێن هەوڵ ئەدەن گورزەکان بەن . ئەگەر گوریس بە دەستەکە لەقەی لە هەر یەکیکدا بەبێ ئەوەی دەس لە گوریسەکە بەردا ئەوا لەقە لێ دراوەکە تێ ئەکەوێ و سەری گوریسەکە ئەگرێ و ئەوەی تر رزگار ئەبێ . بەم چەشنە هەر یەکێ لەقەی لێ بدرێ تێ ئەکەوێ و ئەوەی پێشوو رزگار ئەبێ تا یەکێ بوی هەڵ ئەکەوێ و هەموو گورزەکان دەبێ ( بەبێ ئەوەی لەقەی لیدری ) ، گورزەکان بە سەر خاوەنەکانیان دابەش ئەکا ، ئەنجا بە هەموویان لە تیکەوتووەکە ئەدەن بە گورزەکانیان هەتا جاری لەقەیەك لە یەکیکیان ئەداو خوی رزگار ئەکا ، لەقە لێ دراوەکەش تێ ئەکەوێ و سەری گوریسەکەی ئەگرێ و هەموو بە گورزان لێی ئەدەن تا ئەویش لەقە لە یەکیکیی تر ئەداو خوی رزگار ئەکا ...

# ٣٢ ـ گەنم گەنمانی

ئەم یاری‌یە لەبەینی ( ٣ ـ ١٢ ) گەنج ئەکرێ ، هەموو بازنەیی بەرانبەر یەك دائەنیشــن ، هەر یەکەیان لە جیگای ناوەکەیدا ژمارەیەکی بو دائەنێن یەکی ئەبی بە ( ٩ ) یەکیکی‌تر ( ١٨ ) یەکی ( ٣ ) ، یەکیکی‌تر ... هتد .

یەکیکیان دەس بە یاری‌یەکـە ئەکاو ئەلی : گەنم گەنم ( ژمــارەیەك ئەلی کە بو یەکی دانرابی ، بو وینە ئەلی ) لە نۆیانە . نۆ ئەڵی : لە نۆیان نی‌یە . کابرا ئەلی : ئەی لە چەندانە ؟ نۆ ژمارەییکی‌تر ئەڵی کە لە یەکی لە دانیشتووەکاندابی بو وینە ئەڵی : لە سێ‌یانە . سێ ئەڵی : لە سێ‌یان نی‌یە !. تۆ ئەڵی : ئەی لە چەندانە ؟ سێ‌ش بەم چەشنە ژمارەیەکی‌تر ئەڵی ، واتە هەر یەکەیان ژمارەکە لە سەر خوی لا ئەداو ئەیخاتە سەر یەکیکی‌تر . هەر یەکیکیان ژمارەیەك بلی کە لەم یاری‌یەدا نەبی یا زمانی ببەستری‌و قســەی بو نەکری ( چەنکو پیویستە ئەم پرسیارو وەلامانە بە پەلە بکرین‌و وەلام بدرینەوە ) لە یاری‌یەکە دەرئەچی‌و لە سەریەوە دەس پی ئەکەنەوە . بەم جورە یەکە یەکە لە یاری‌یەکە دەرئەچن تا لە دووابی‌دا یەکی ئەمینیتەوە کە هیچ هەلەیەك ناکات‌و بە سەر هەموویاندا زال ئەبی .

ئەم یاری‌یە بە زوری فـەقێ‌یەکان ئەیکەن لە پاش راتبە کۆ کردنەوەدا ، کە تەنیا شـیویکی خوشیان لە گەل راتبەکەدا کۆ کردبیتەوە ، هەر یەکی لەم یاری‌یەدا سـەرکەوی ئەوەیان شیوە خوشەکە ئەخوا ، یا هەر خواردنیکی تربی کە لە خواردنەکانی‌تر خوشتربی‌و تەنیا بەشی یەکی بکا ، ئەوانەی تریش خواردنەکانی‌تر ئەخون .

## ٣٣ ـ مەتەل

گەورەو بچووك ، کوڕو کچ ، ژن‌و پیاو ئەم یاری‌یە ئەکەن ، هەر تەمەنی جوری مەتەلی خوی هەیە . کە چـەند کەسی بۆ رابواردن لە گەل یەك دائەنیشن ، بو تاقی کردنەوەی ووشیاری‌و زیرەکی ئەم یاری‌یە ئەکەن ، هەر جارەی یەکیکیان مەتەلی ئەلی‌و ئەوانەی‌تر هەموو بە جاری بیری لی ئەکەنەوە تا یەکیکیان هەلی دینیتەوەو ئەیزانی . تەمانەش چەند وینەیەکن لەم مەتەلانە :ـ

١ ـ سـی هیلکە بە سەر حەفسەت‌و دوو کەس دابەش بکە بە مەرجی هەر یەکەیان هیلکەیەکی بەرکەوی ؟

( مەبەست لەم مەتەلە حەفسەتە «حفصة» کە ناوی کچیك یا ژنیکە نەك حەفسەدی ژمارە ) .

٢ ـ هەتا پڵ ( پەنجە )ی لە قووڵی رانەکەی کاویژ ناکا ؟ « مقص»
٣ــ هەتا لیدەی هەر دەژیژی ( یژینگ ) .
٤ــ هەر جیگایەك گای ســـوری لی بنوێ گیای لی شین نابێ ؟ « ئاگر » .
٥ــ سەری بە تۆ بێ بە دایکت ؟ ( مەمك ) .

بەلام مەتەل بە شیوەی هونراوە زیاتر بە کاردێ وەك :

١ ــ بنوێ گایە هەڵسێ چیایە ؟ ( رەشماڵ ) .
٢ــ چوار برا هەنە لە چومەکی تیران داوینە گومەکێ ؟ ( گوانی چێڵ لە کاتی دۆشیندا ) .
٣ــ هەورۆکــە هەورۆکە لِی دەباری بەفرۆکە ( هیلەگ ) .
٤ــ مامیکم هەیە لە دەشتی کەچە شیریکی لە پشتی . ( دووپشك ) .
٥ــ بە عیساکەم بە مووساکەم هەردوو لنکی لە حەواکەم زیڕو هوژی پی پەیاکەم . ( شەغرە لە کاتی بارکردنا ) .
٦ ـ دوو بەندو بەندەکە ، دوو دەفـو دارەکە . ( تەرازوو )
٧ــ ئەم لای دارە ئەولایدارە تێیدایە دووگوجیلەی هارە (خەنجەر)
٨ــ بە پیوە شەپلتەی تیوە . ( کەندوو ) .
٩ــ چواری مامە فەقێ ، هەشتێ حەتەلوتی
حەتەلوتی رەوکونی مامە فەقێ شەوکونێ ( جوت کردن )

١٠ ــ تەپ لە سەر تەپی دەستت لە رەپی . ( دەستاژ ) .

١١ ــ لە ســـەری یەکێکە لە بنی دوو بە قوونی باو باپیرتدا چوو ؟ ( شــــەرواڵ )

١٢ ــ نە بایە نە بارانە چلك چکە لە دارانە . ( کوندەلان ).

١٣ ــ نۆ نوردی نۆ نان نۆ نان هــەر کوفتەی نۆ پشیلە لە سەر هەر نانی نۆ کوفتە لە سەر هەر پشیلەی نۆ فەرخە لەبەر . [ «٥٩٠٤٩» فەرخە پشیلە ] .

١٤ ــ هەر لیرە هەتا مەککە هــــەموو مەژی سور بەلەکە بە ئەستەویری گوانان دەکا ؟ ( کچ ) . .

١٥ خوی هەندوکە بە دەندوکە
لە پیش حاکمان دەڵێی بووکە . ( چرا )

١٦ ــ مامبکم هەیە لە دەشتي حەفسەت کونی لە پشتی ( ژیشك )

١٧ ــ خانیەکم هەیە تاریك پڕ حوشتری مل باریك [ شارە میروستان ]

١٨ دەرخونە لە ســــەر قوونە چەند خۆشە چەند بە رووەنە [ دوونکی مەژ ] .

١٩ ــ هژم کردە مەژەکی سەد مەژ هات لە رەنکەکی [ زەدەوالە ]

# ٣٤ ـ میری گزیرانی

ئەم یاری‌یە لە شەوانی دریژی زستاندا لە دیوەخانەکاندا ئەکرا کە زۆربەی دانیشتووەکان تیدا بەشدار ئەبوون . پەنجەی نیوان میرە ، پەنجە شادە ( دۆشاو مژە ) گزیرە ، وە پەنجەی ( برای تووتـــە ) مـەلایە ، پەنجەی بچووك مـــەلا ژنە . ئەنگوستیلەیەك دینن بە ریزە هەر جارەی یەکی لە بەشدارەکان ئەنگوستیلەکە بۆ ئاسمان هەڵ ئەداو لە کاتی هاتنە خوارەوەی لە ئاسمانەوە پەنجەکانی دەستیکی ئەخاتە بەری ، هەر یەکەیان هەوڵ ئەدا ئەنگوستیلەکە بکەویتە پەنجەی نیوانی تاکوو ببی بە میر ، یا پەنجەی شادەی بچیتە ناو ئەنگوستیلەکە تا ببی بەگزیر کە یەکی لە یاری‌کەرەکان بوو بە میر ئەوا بە ئارەزووی خۆی فەرمان دەر ئەکا ، بەم جورە یەکیکیش ئەبی بە گزیر ، گزیر گورزی بە دەستیەوە ئەگری بۆ بەجی هینانی فەرمانەکانی میر . کە یەکی ئەبی بە مەلا ، میر ئەلی : مەندیلیك و کەواو سەڵتە بۆ مەلا بکە ؟ گزیر گورزی لە سەری مەلا ئەداو دوو گورزیشی لە پشتی ئەداو ئەلی : میرم بۆیم کرد . میر ئەلی : دووانزە قران مانگانە بۆ مەلا ببڕەوە ؟ ، گزیر دووانزە گورز لە دەستی مەلا ئەداو ئەلی : میرم بۆیم بڕیەوە . بەم چەشنە هەر شتیکی پیویستی مەلابی میر فەرمان ئەکاتە سەر گزیر کە بۆی بکا ، گزیریش بە گورز لیدان بۆی ئەکا . کە یەکیکیش ئەبی بە

مەلا ژن ، میر بە گزیر ئەلی : چارۆکەو کلاوو دەسرۆك بۆ مەلا ژن بکە ، گزیریش چەند جارێ گورزەکە لە سەرو کۆلاکی مەلا ژن ئەداو ئەلێ : میرم هەمووم بۆی کرد ، میر ئەلی : دە قرانیش مانگانەی بۆ ببڕەوە لە بەر خانری مەلا با بێ مانگانە نەبێ ، گزیریش دە گورز لە دەستي مەلا ژن ئەدا .

ئەوانەی تریش کە ئەنگوستیلەکە هەڵ ئەدەن ئەیانەوێ بین بە میرو بە مرازش ناگەن . میر ئەڵێتە گزیر ئەم مروڤانە زۆر حەز لە گەورەیی‌و زەنگینی ئەکەن ، هەر یەکە مانگانەیەکی زۆریان بۆ ئەبڕێتەوەو ئەلی : ئەمەیان ( ٢٠ ) قرانی بدێ ، ئەوەشیان سی قرانی بدێ ... هتد

گزیریش هەر یەکە چەندیان بۆ بڕابیتەوە هەندە گورزەیان لە دەستی ئەدا . ئەگەر یەکیکیش ئەنگوستیلەکەی هەڵداو بوو بە میر ئەوا ئەبێ بە فەرمان رەوا ، فەرمان.ئەکاتە سەر گزیرو ئەلی : چل ، پەنجا قران بدە بە میری پیشوو چەنکو پیاویکی گەورەبوو دەستو پێ سپی‌بە لی کەوتیە ، کاسبي پێ ناکرێ گزیریش هەندە گورزە لە دەستي میرەکەی پیشوو ئەداو ئەلی : قوربان قرانەکانم دایی ، میر ئەلی : کورتەك‌و شەرواڵیکی باشی بۆ بکە ، گزیریش دوو گورزی چاك لە پشتی کۆنە میر ئەدا ، میر ئەلی پێ‌ژدین‌و پیلاوو مشکیەکی چاکیشی بۆ بکە . گزیریش

دوو گورز لە پێیەکانی کۆنەمیر ئەداو دوو لە سەری‌و یەکیشی لە ناوقەدی ئەداو ئەڵی : قوربان هەەووم بۆی کرد .

ئەگەر یەکێکی تریش بێ بە میر ئەوا ئەبی بە فەرمان رەواو فەرمان ئەکاتە سەر گزیر بۆ لیدانی میرەکەی پیش خۆی بە جزو بەرگ‌و پوول بژینەوە .

# ٣٥ ـ نان نانانی

سێ کەس لەم یاری‌یە بەشدار ئەبن . یەکی ئەبی بە نانەوا ، یەکێکیش ئەبی بە تەندوور ، یەکێکی تریش هاوار بو نانەوا ئەبا .

نانەوا خەریکی نان پەوەدان ئەبی ، دەستی خۆی پان ئەکاتەوەو لە یەکی ئەدات‌و دەستیکی بە تین لە پشتی تەندوورەکە ئەدا . لەم کاتە یەکی بە تەنکاوی دێ‌و بە نانەوا ئەڵی : بڕۆ ماڵەوە دایکت مردووە !. نانەوا هیچ خۆی تیك نادا ، کابرا ئەڵی : کوڕە باوکت مردووە ؟! نانەوا ئەڵی : من دەس لە کاری خوم هەڵناگرم . کابرا هەر ئەڵی یەکێکت مردووە تا هەموو خیزانەکەی نانەوا ئەژمیرێ لە خوشك‌و براو دایك‌و باوکی ، نانەوا هیچ گوی ناداتی‌و کاری خوی ناوەستێنی .

له دووایی‌دا کابرا به نانه‌وا ئه‌لی : کوژه ژه‌نه‌که‌ت مردووه !
نانه‌وا ته‌نگاو ئه‌بی‌و به په‌له له‌په قوزیك له سه‌رو چاوی
ته‌ندووره‌که ئه‌سوی‌و به هاوارو رۆ رۆ رائه‌کا . ته‌ندووریش
ده‌س ئه‌کا به جنیوو به دووایدا رائه‌کا ، دانیشتووه‌کانیش گه‌لی
پی‌یان پی ئه‌که‌نن .

# ٣٦ ـ هووڵه ملانی

گوریسیك ئه‌خه‌نه مل ( ئه‌ستۆ )ی دوو گه‌نج که له
به‌رانبه‌ر یه‌کدا به پیوه ئه‌وه‌ستن ، هه‌ر یه‌که‌یان بۆ پاشه‌وه‌ی
خوی ئه‌کشیته‌وه‌و ئه‌وه‌ی‌تر بۆ خوی رائه‌کیشن ته‌نیا به هیزی
ملی ، به بی ئه‌وه‌ی ده‌ستیان بۆ یه‌ك دریژ بکه‌ن ، جا ملی کامیان
به هیزتر بی ئه‌ویان ئه‌وه‌ی‌تر بو خوی رائه‌کیشی‌و ئه‌یبه‌زینی ،
خوشی بو دوایه‌وه ئه‌گه‌زینه‌وه . جا چه‌ندی زۆر به دووای
خویدا رای‌بکیشی هه‌نده باشتر سه‌ر ئه‌که‌وی‌و هیزی خوی ده‌ر
ئه‌خا ، ئه‌وه‌ی تریش تی‌ئه‌که‌وی‌و پی لی ئه‌نی که هیزی
ئه‌وی نی‌یه .

# ٣٧ ـ هەدار هەدارانی

ئەم یاری‌یە لە بەینی ( ٤ ـ ٨ ) گەنج ئەکرێ ، هەر یەکەیان داریکی بە دریژایی لا باڵیکیان لایە ، یەکیکیان هەموو دارەکان کۆئەکاتەوەو بە هەردوو دەستەکانی لە سەر سەری خۆی ئەیان گرێو بۆ پشـــت خۆی هەڵیان ئەدا ، ئەمجا پاشەو پاش ئەکشیتەوە بەبی ئەوەی ئاوڕ بۆ پاشەوە بداتەوە ، هەر داریکی بکەویتە بەر پی‌یەکانی خاوەنەکەی هەڵی ئەگریتەوە تا تەنیا دارێ ئەمینیتەوەو ناکەویتە بەر پی‌یەکانی . ئەم دارەش بە هیزی خۆی بە دەستیکی بۆ دوور هەڵی ئەدا ، لە کوێ کەوتەوە سەر زەوی خاوەنەکەی ئەچی لەم جیگایەدا ئەی‌چەقینی .

ئەوانەی تریش ( جگە لە خاوەنی دارە چەقاوەکە ) هەموو لە تەنیشت یەك ئەوەستن‌و پشتیان ئەخەنە دارە چەقاوەکەو هەر یەکەیان لە جیگای خویدا دارەکەی بە دەستیکی بە ژیر لنگیدا هـەڵ ئەدا بۆ لای دارە چەقاوەکە ، دارەکە لە کوێ کەوتەوە لەوێش تفیك هەڵ ئەدەن بۆ لای دارە چەقاوەکەو لە جیگای تفەکەیان هەر یەکە قوڵتیك ئەکەن بۆ نیشان کردنی جیگاکانیان . ئەمجا یەکە یەکە هـــەرکەس لە جیگای خۆیەوە دارەکەی بۆ دارە چـەقاوەکە هەڵ ئەدەن بە دەستیك ، هەر یەکی لە دارە چەقاوەکە بدا بە چوززەکە ئەچی هەموو دارەکان

دینیتەوە ( کە بۆ دارە چەقاوەکە هەڵدراون ) لە گەڕانەوەدا خاوەن دارەکان یەکە یەکە کە دارەکانیان بە سەردا دابەش ئەکانەوە پێی ئەڵێن : مامە حاجی ماندوو نەبی ؟.

ئەویش ئەڵی : وەت تی‌کوتم گەورە نەبی .

ئەمجا یەك بە درێژایی دارەکەی خوی بۆ دارە چەقاوەکە ئەچێتە پیشـــەوەو جیگاکەی تازەی نیشان ئەکا . بەم چەشنە دارەکانیان هەڵ ئەدەنەوەو هەر یەکی لە دارە چەقاوەکە بدا هەموو دارەکان دینیتەوەو یەك بە درێژایی دارەکەی خوی بۆ دارە چەقاوەکە ئەچێتە پیشەوە .

بەلام ئەگەر هـــەموویان دارەکانی خـویان بۆ دارە چەقاوەکە هەڵداو هیچیکیان لی‌یان نەدا ئەوا هەموو بە راکردن ئەچن هەر یەکە دارەکەی خوی دینیتەوەو هەوڵ ئەدا نزیکترین جیگا لە دارە چەقاوەکە بو خوی بگریتەوە ، جا جیگای هەر یەکی بی ، خاوەنی دارە چەقاوەکەش لە گەڵ ئەواندا رائەکاو دارەکەی هەڵئەکیشـــیو بە غار دیتەوەو جیـــگایەك بۆ خوی ئەگریتەوە .

هەر یەکە جیگایەك بو خوی ئەگریتەوە تەنیا یەکی ئەمینیتەوە کە ئەکەویتە دووای هەموویانو جیگای بو نامینیتەوە چەنکو خاوەنی دارە چەقاوەکە جیگایەکی بو خوی گرتوەتەوە ئەوەی بی جیگا ئەمینیتەوە ناچار دارەکەی لە جیگای دارە

چەقاوەکەی پیشوودا ئەچەقینێ ، ئەوانەی تریش هەر یەکەیان لەو جێگایەی کە گرتوویانەتەوە دارەکانیان بۆ دارە چەقاوەکە هەڵ ئەدەن وەکوو جارانی پێشوو .

هەر یەکێکیان زۆر جار لە دارە چەقاوەکە بداو هەندە بوی ئەچێتە پێشەوە تا ئەگاتە دارە چەقاوەکەو ئەبێ بە حاجیو لە یارییەکە دەر ئەچێ ، بەڵام بە هێزی خوی دارێك لە دارە چەقاوەکە ئەداو دووری ئەخاتەوە لە یاری کەرەکانیتر وە لە کوێ کەوتەوە سەر زەوی لەوێ ئەیچەقینێتەوە . بەم جورە یەکە یەکە ئەبن بە حاجی تەنیا خاوەنی دارە چەقاوەکە نەبێ تێ ئەکەوێ . ئەمجا چاوی تێکەوتووەکە ئەبەستنەوەو ( تیلکە مەسوسێ )ی پێ ئەکەن تا یەکێك ئەگرێ ، خوی رزگار ئەکاو گیراوەکە لە جێگای ئەودا چاوی ئەبەسترێ ئەوەش هەرووها .

# ٣٨ ـ هەڵگرتنی شاهی ئەجندان

ئەم یارییە لە بەینی پێنج گەنج ئەکرێ . یەکێکیان لە سەر پشت درێژ ئەبێو هەر دوو گۆیەکانی ئەگرێ بە هۆی پەنجەی دۆشاو مژەی هەر دوو دەستەکانی تا گۆی لە ووتەی هیچ کەسێ نەبێ وە خۆی ئەکا بە مردوو ، چوارەکەی تریش

دوویان له بەرانبەر یەکدا له دیار سەری مردووەکە دائەنیشن دووەکەی تریش له بەرانبەر یەك له سەر چینچکان دائەنیشن له نزیك رانەکانی مردووەکە .

ئەوەی لای سەری که له تەنیشتی راستی دانیشتووە ئەبێ بە سەردار ، هەر چوار سەریان له یەك نزیك ئەکەنەوە . سەردارەکە بە دەنکیکی نزم ئەلێته دانیشتوەکەی دەسته راستي خۆی : ئەمه چیه ؟. ئەویش له گەل بەرانبەرەکەیدا ئەم ووتەیه دووباره ئەکاتەوە ، بەم جوره هەر یەکیکیان ئەم پرسیاره له دانیشـــتووەکەی دەسته راستي خوی ئەکا تا ئەسوڕیتەوە لای ســەردارەکە ، ئەمجا سەردارەکە ئەلی : ئەمه شاهی ئەجندانه مردووە ، هەر چواریان له گەل یەکدا ئەم ووتەیەش دووباره ئەکەنەوە تا ئەگانەوە سەردارەکە . سەردارەکە ئەلی : چی لی ئەکەن ؟. دیسان هـــەموو دووبارەی ئەکەنەوە وەکوو جارانی پیشوو . ئەمجاره سەردارەکە ئەلی : ئەیبەین بۆ قەبران . که ئەم قسـەیەش له ناو هەر چواریاندا گەڕا سەردارەکە ئەلی : چوار له ئیمه هەزاران لەوان . که هەموویان ئەم ووتەیەش دووباره ئەکەنەوە ، هەر یەکەیان دوو پەنجەی شادەی له راستی خۆیدا ئەخاته ژیر لەشـــی مردووەکەو سەردارەکه فیتەیەکی دوورو دریژ ئەکا ، له گەل فیتەکه هەموویان بە زانایی دەستەکانیان له سەر خۆ بەرز ئەکەنەوە بۆ ئاسمان که مردووەکەی له سەرەو

به هێزێکی کەم لە گەڵ دەستیاندا بەرز ئەبێتەوە لە زەویدا کە هەر پاڵی داوەتەوەو لە سەر گازی پشت درێژ بووە ، جاری وا ئەبێ تا راستی سەریان بەرزی ئەکەنەوە ئەمجا ئەیخەنەوە سەر زەوی .

ـ بەلام لە کاتی بەرزکردنەوەیدا ، یا لە کاتی هێنانە خوارەوەی یەکی بڵی ( بسم اللە ) مردووەکە لە سەرڕا ئەکەوێتە خوارەوەو ئازارێکی زۆر ئەبینێ .

# ٣٩ ـ هەیاران ( کوسە بە با )

لە سالانی کەم باراندا ئەکرێ کە مەترسی ئەبێ لە سەوز بوونی دەخڵو دانە چاندراوەکان . لە بەر ئەمە چەند گەنجی کۆ ئەبنەوەو یەکی ئەکەن بە ( کۆسە بە با ) ، هەموو رووی رەش ئەکەن بە تەنی سێل ( ساج ) ، زەنگوڵێکیشی ئەخەنە ملی ، جلێکی کۆنو شڕیشی ئەکەنە بەر ، تۆبزێکی ئەستووریش بە دەستیەوە ئەگرێ . گەنجێکی جوانیش ئەکەن بە بووك ، جلی بووکێنی بە تەواوی لە بەری ئەکەن ، وای ئەڕازێننەوە کە لە گەڵ بووك جیانەکرێتەوە بۆ ئەو کەسەی سەیری ئەکا . بەم چەشنە بە ناو گەڕەكو کۆلانەکاندا ماڵ بە ماڵ

ئەگەڕێن ، یا لە گوندێکەوە ئەچن بۆ گوندێکیتر . لە پێش هەر ماڵی کوسە دوو سێ تۆبز بە هێز لە دەرگای ماڵەکە ئەدا هاوڕێکانیشی ئەڵێن :

هەیاران و مەیاران
یا خوا بنێری باران
لۆ فەقیرو هەژاران
ئەو ساڵ بباری باران
گەنم بڕزێ لە چاڵان
گەنمی حەسەن‌و حوسێنیان
هەموو قڕبوون لە نینان

جا هەر ماڵی نەختێ دانەوێڵەیان بۆ دێنن‌و مەنجەڵە ئاوێك ، یا چەند جامە ئاویش ئەڕشێنن بە سەر کۆسەکەدا . جاری‌وا ئەبێ چەند گەنجێك بووکەکە لە کۆسە ئەشارنەوە ، کۆسەش کە بووکەکە بزر ئەکا چەند جەڕەو گۆسکەی ئەکەوێتە بەر چ‌اوی هەمووی بە تۆبزان ووردو خاش ئەکا ، لە بەر ئەوە گەنجەکان ناچار ئەبن بووکەکەی بۆ دێننەوە ، ئەمجا کۆسە بووکەکە ماچ ئەکاو بە دەورەیدا ئەگەڕێ گورزەکەی هەڵ ئەوەشێنی‌و پاریزگاری ئەکات . بەم جۆرە ماڵ بە ماڵ ئەسوڕێنەوە تا ئێوارە دەمەو ڕۆژ ئاوا ، چەند منداڵی ئەم گوندەش هەیە هەموو بە دوایان ئەکەون‌و گاڵتەیان پێ ئەکەن ئەڵێن :

به‌لام كه كۆسه هێرشیان بۆ ئه‌باو نۆبزه‌كه‌ی هه‌ل ئه‌شه‌قینی هه‌موو منداڵه‌كان به‌ جاریٚ رائه‌كه‌ن له‌ ترسان له‌ به‌ر دیمه‌نه‌ ترسینه‌ره‌كه‌ی ، كه‌ ترسیان شكا هه‌میشه‌ به‌ دووایدا رائه‌كه‌نه‌وه‌ .

ئه‌مجا ئێواره‌ ئه‌م گه‌نم‌و جۆیه‌ی كه‌ كۆیان كردوه‌ته‌وه‌ هه‌مووی به‌ خواردنیكی خوش ئه‌ده‌ن‌و له‌ گه‌ڵ یه‌كدا ئه‌ی‌خون جا میوژ بیٚ ، یا هه‌نار ، یا هه‌ر شتیكی‌تر .

# ٤٠ ـ هه‌ی كه‌ر هه‌ی كه‌ر

كه‌ چه‌ند گه‌نجی هه‌ست ئه‌كه‌ن یه‌كێكی لاساریان له‌ گه‌ڵدایه‌ كه‌ له‌م یاری‌یه‌ نه‌شاره‌زایه‌ ، هه‌موو گه‌نجه‌كان له‌ ناو خۆیاندا ریك ئه‌كه‌ون‌و پیلانی بو دائه‌نینه‌وه‌ ، له‌ ناو خویاندا ئه‌ڵێن : با یاری ( هه‌ی كه‌ر هه‌ی كه‌ر ) بكه‌ین ، نه‌شاره‌زاكه‌ش له‌ گه‌ڵیاندا به‌شدار ئه‌بیٚ ، هه‌ر یه‌كه‌ چاوی به‌ ده‌سته‌سرٚیٚ یا پارچه‌ په‌رٚۆكیكی خاوین ئه‌به‌ستن ، كه‌ نه‌شاره‌زاكه‌ چاوی خوی ئه‌به‌ستي ، ئه‌وانه‌ی‌تر هه‌ر یه‌كه‌ په‌رٚۆكه‌كه‌ له‌ چاوی خویان ئه‌كه‌نه‌وه‌و ئه‌ی‌خه‌نه‌ به‌خه‌ڵیان . ته‌نیا لاساره‌كه‌ به‌ چاو به‌ستراوه‌یی

ئەمینیتەوە . ئەمجا ئەڵێن : هەر یەکێ لە جێگای خویدا هەڵپەڕێو بسوڕێو بلێ : هەی کەر هەی کەر لو پیاوی کەر .

هەموو بە دەورەی چاو بەستراوەکە هەل ئەپەڕنو ئەڵێن : هەی کەر هەی کەر لو پیاوی کەر ، گاڵتەی پێ ئەکەن خوشی لە گەڵیاندا بەشداری ئەکاو گاڵتە بە خوی ئەکا بە بێ ئەوەی هەست پێ بکا کە ئەوانەیتر هەمووچاوی خویان کردووەتەوە .

لە دووایی‌دا کە زۆر گاڵتەی پێ‌ئەکەنو پێی پێ‌ئەکەنن یەکێکیان پێی ئەخـــانە بەر پێیەکانیو بەری ئەداتەوە . هەر یەکەیان پەڕۆکەکانیان لە باخەڵیان دینینە دەرەوەو بە دەستیانەوە ئەگرنو ئەڵێن : ئەمجا با چاومان بکەینەوە . کابراش کە چاوی خوی ئەکاتەوە هەموویان هەر یەکە پەڕۆکێ خوی بە دەستیەوە گرتووە هیچ هەست پێ ناکا کە گاڵتەیان پێی کردووە ئەلێ : جا ئەم یارییە خوشیەکەی چیبوو ئیمە کردمان ؟. ئەوانەیتر زیاتر پیکەنین ئەیانگرێو گاڵتەی پێ ئەکەن .

جا ئەگەر کابرا لە پیلانەکە بگات زۆر بە خـــویدا ئەشکیتەوە ، کەخویو ئەم هەموو کەسە گاڵتەیان پێ کردووە لە بەر نەفامی خوی .

# سوپاس

- پڕ بە دل سوپاسی ماموستای بە ریز مەجید ئاسنکەر ئەکەم کە چەند سەرنجیکی جی‌گری بو روون کردمەوە .
- زۆر سوپاسی ماموستای بە ریز کمال صادق‌و کاك ناظم کاکل ئەکەم کە سەرپەرشتی لە چاپدانی ئەم پەراوەیان کرد ، هەر وەها کاك رشید محمد مردان زەنگەنە کە بە جوانی پیتەکانی چنی .
- زۆو سوپاس بو کاك فاتح حاجی محمد دارەبەنی کە لە چەند یاری‌یەك یاریدەی دام .
- سوپاسی گەرمم بو خوش‌نووس کاك علاءالدین محمد رشید کە نەخشەی بەرگەکەی کیشاوە .

# ناوەڕۆک

| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |

| بـابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| خانی چولکە | ٩١ |
| دوونکە مەڕانی | ٩٢ |
| سابونە رەقە | ٩٤ |
| سووتام برژام | ٩٥ |
| مۆری خۆلکانی | ٩٧ |
| مەگری مەگری مەگری | ٩٨ |
| هەلور بەلور ( زاین ماین ) | ١٠٠ |
| هەلیکـۆ | ١٠٣ |
| هەیمشك ، مشك مشك | ١٠٤ |
| ٣ ــ یاری‌یەکانی هاوبەشی کوڕو کچ - بابی بابی | ١٠٥ |
| بچین بچین | ١٠٨ |
| بووکە بە بارانە | ١٠٩ |
| پڕنا پوش | ١١٠ |
| تاقمانەسجووت | ١١١ |
| تەڕو هیشکانێ | ١١٢ |
| حندر حۆپ | ١١٤ |
| حەکایەتی میشە | ١١٥ |
| دەچیە بەر مەڕی ؟ | ١١٦ |
| سویندە گورگانە | ١١٦ |
| فڕی فڕی قەل فڕی | ١١٧ |
| قجیلك بابەجیلك | ١١٨ |

| بابەت | لا پەڕە |
|---|---|
| کەرەکم بار کردی‌یە | ١١٩ |
| گەشت‌و سەیران | ١٢٠ |
| ماڵ ماڵانی | ١٢٢ |
| مەیل مەیلانی | ١٢٣ |
| مەڕی زمزی | ١٢٤ |
| بەشی دووەم یاری‌بەکانی گەورانە | ١٢٧ |
| ئەزە لەزە ( ئەشکە لەشکە ) | ١٢٩ |
| بارە خیبانی | ١٢٩ |
| بەللوریێو وەیارۆك | ١٣٠ |
| تەررکی بن بەرریێ | ١٣٣ |
| تەڵەو ریویانی | ١٣٤ |
| تەندوورە سورکە | ١٣٥ |
| جفزی | ١٣٦ |
| خەجە ررۆ ( خواجە روۆ ) | ١٣٧ |
| دار کیشکانی | ١٤٠ |
| دروینەی بەکرەبی | ١٤٠ |
| دزینی هەش | ١٤٣ |
| دەستارر | ١٤٥ |
| دەمە تەقی | ١٤٧ |
| دیزەو گوزە | ١٤٨ |
| راوە بەراز | ١٤٩ |

